## پێشکەشە بە روحی باوکم

منیش لێرەم لەنێو ئەم باسە دورو درێژەدام, کە ئێستاکە بە وردی دەیگێڕمەوە, وەك حیکایەتخوانێك باسی (ئەو) ناکەم, خۆم بەشێکمو بەشێك بووم لەو بەسەرهاتەی نێو ئەم کتێبە, بەڵام دەمەوێ لەسەرەتاوە وەکو خۆی بۆتی بگێڕمەوە, باسی (ئەو)و "شێتە"و "نامۆ"ت بۆ دەکەم, کە سێ کەسی سەرەکی نێو ئەم چیرۆکەی ئەمڕۆی منو جیاوازە لە هەموو باسو حیکایەتەکانی دیکەم, ئەوەش نەبێ حیکایەتێکی ئەفسانەییو خەیاڵیت بۆ بگێڕمەوە, وەکو پێم ووتی منیش بوومە بەشێك لەوانو کە سەرەتا وەکو تۆ خۆم بە کەسێکی نامۆی نێو ئەم ماڵە دەزانی.

## بەشی یەکەم

لەسەر پێخەفە ساردو سڕەکەی ڕاکشابوو، دەیویست بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێك بكاتەوە پێڵوەكانی جوت بكاتو بخەوێت، بەڵام ئەندێشەكانی هەر ئەمدیو ئەودیویان پێ دەكردو نەیاندەهێشت خەوی لێبكەوێت، هەستایە سەرپێو جێگەكەی جێهێشت، چوو بە لای كەنتۆرەكەی، تاكێكی كردەوە كە هەندێ پۆشاكی دەرەوەی تێدابوو جگە لەوەی لەخوار جلەكانەوە هەندێ سوراوو سپیاوی ڕیز كردبوون بەتەك ئەوانەوە جانتایەكی شانیی خۆڵەمێشی دانرابوو، لەنێو جانتاكە نامەیەكی قەدكراوی دەرهێنا ، پێدەچوو بۆ كەسێكی نوسیبێتو بەسەریا بچێتەوە یان لە كەسێكەوە بۆی هاتبێ، هەر بە ئەستەم لێوەكانی دەجوڵاندو نامەكەی خوێندەوە:

" خۆشەویست سڵاوێكی گەرم..

گیانی من.. سوێند بەو عیشقەی خودا بەخشی بەمنو منیش بە تۆو تۆش قەدری نازانی، خۆشم دەوێی پڕ بە مانای خۆشەویستی.

ئارەزووم دەكرد چەند كاتێك لەگەڵت دانیشمو وەكو جاران بۆت بدوێم، بەڵام تۆی بە ڕوخسارێكی ماتو چاوێكی بە گومانو دڵێكی پڕ لە قینو گیانێكی بێ لێبوردە، ڕێگەم پێ نادەی، منیش ناچارم بە قەڵەمو كاغەز لەگەڵتدا بدوێم

گیانی من.. بمبورە گەر هەرچ قسەیەك یان ڕەفتارێكم دڵی تۆی ئێشاندبێ، بەڵام بێ گومانبە مەبەستم ئازاردانی تۆ نەبووە، هەرگیز نەمویستووە كەسانێك تورەت بكەنو دورت بخەنەوە لە نیگام، تۆ هەموو كات قیبلەی عیشقی من بویتە، كەچی لەسەر چەند قسەیەكی ناشرینەكان خۆت تورە كردووەو نامدوێنی، ڕۆژی سەدجار داوای لێبوردن دەكەمو لێم نابوری، گەر منت ناوێ بە بێ ئەوەی خۆت تورە بكەیت پێم بڵێ خۆشمناوێیتو تەواو، ئەو ساتە تێدەگەم كە منیش دەچمە ڕیزی ئەو كچانەی بەجێتهێشتن چونكە من لەوان زیاتر نیم.

تكایە پێم بڵێ، چیدی بەرگەی ئازار ناگرم، تاكەی سوژدەت بۆ ببەمو لێت بپاڕێمەوەو چاوەڕێی بەهەشتت بكەم، گەر تۆ هەموو ڕۆژێك بە گڕی دۆزەخی عیشق دەمسوتێنی؟ چیدی مەمگرییێنە ئاو لە چاوم وشكی كرد، ئێستاش تێناگەم ڕاستم یان بە هەڵەدا چومە، ئازیزەكەم تۆ پێم بڵێ بەر لە وەستانی كاتژمێری خۆشەویستی".

ئەم قسانەی کردوو بیٚ دەنگ بوو..! ئەو نامەیەی خوێندەوەو فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە, نەمزانی مەبەستی چی بوو, یان لەگەڵ کێی بوو, نەمزانی ئەو رۆژە چی بەسەر هاتبوو کە وای لێکردبوو کە هێندە وەڕس لەو ژورەی پڕبوو لە بۆنی تەنیایی دابنیشیٚ..! وا دیار بوو چاوەڕوانی زەنگی مۆبایلەکەی دەکردو هەر لێینەدەدا..!

"زۆر بێتاقەتم, ئارەزووی مردن دەکەم بەڵام ئەفسوس جورئەتی خۆکوشتن ناکەم, ئارەزووی رۆیشتن دەکەم بەڵام نازانم بۆ کویٚ بڕۆم, شوێنێکم نیە رووی لیٚ بکەم, ئارەزووی گریان دەکەم کەچی زۆر سەیرە فرمێسکەکانم قەتیس ماونو ناتوانم بیانڕێژم, ئارەزووی دەربڕینی پەیڤەکان دەکەم بەڵام کەس ئارەزووی گویٚ گرتنم ناکا..

نیگەرانم لە خۆمو هەموو بونەوەرێکی ئەم خوا کردەیە, ماندوم ماندوو, وەك ماندوێتی ژیان بە دیار کوشتنی منەوە..

ئەستەمە هەناسەدان لە پێناو ژیان, ئەستەمە ژیانیش بیٚ بەختەوەری.

ژیان لەو منداڵە ساوایە دەچیٚ زمانی ناپژیٚو بڵیٚ برسیمە بۆیە دەگریم.. ژیان لەو جگەرەیە دەچیٚ بە لێوی هەرزەکارێکەوە خۆ دەخواتەوە, ژیان لە زۆر شت دەچیٚ تەنها لە خۆی ناچیٚ چونکە بێژووی قەدەرێکە, منو (ئەو) ناومان لێنا زیان نەك ژیان".

دوای خوێندنەوەی نامەکە, ئەم پەخشانەی بە فرمێسك لەپشتی لاپەڕەکە نوسیەوە.

کاتیٚ کە لەگەڵ خۆی دەدواو کە لە پەخشانەکشدا وتی منو (ئەو), نەمزانی ئەوی لای (ئەو) کیٚ بوو! بەڵام بێگومان بووم لەوەی کەسێکە تا سەر ئێسك روحی ئازارداوە.

چونکە تا وشەیەکی لەدەم دەهاتە دەر دەیان جار تەماشای مۆبایلەکەی دەکردەوە, لە کەسێکی زۆر گۆشەگیر دەچوو, بەڵام پێدەچو کە لە پشت ئەو بێدەنگیەو مەنگیەیدا شت هەبن, وەك بەسەرهات, وەك روداوی سەخت, وەك لەبیرچونەوەی بیروهۆش, وەك شێتی, چونکە ئەویش بەدەر نەبوو لە مێینەی ئەو وڵاتەی (ئەو) تیایدا دەژیا, وەك زۆربەی کچانی ئەو وڵاتە هەردەم بێبەش بوو لەهەستو سۆزو لەترسی زمانی خەڵك بەردەوام جەلادێك بوو بۆ خواستەکانی خۆی, هەرچی حەزێك یان ئارەزوویەکی شك بردبا لەناخیدا

دەیکوشت, بەر لەوەی گوێیەکان بیبستن و بیکەنە گوریسی باس و بەدوای خۆیاندا ڕایکێشن, ناچار لەنێو قەدەرە داخراوەکەیدا ئەوینێکی کردبووە پەنجەرەو بەڕووی خۆیدا کردبویەوە, تا لەو پەنجەرەیەوە تەماشای سروشتی دونیای لێوە بکات و خۆی تیا ببینێتەوە.

نامەکەی خستەوە نێو جانتا شانیەکەی و لە بەرخۆی گۆرانیەکی وتەوە "کچ ووتی منیان دا بە شوو هەرچەندە بە دڵیشم نەبوو" لەسەر یەك ئەوەندەی دەوتەوەو دێڕەکەی دوای ئەوەی نەدەهاتەوە بیر چونکە سەرقاڵی بیرکردنەوەیەکی قوڵ بوو, بۆ جوانکردنی ژیان دەیویست شتێك بڵێ لە شیعر بچێ و لەو گۆرانیەش جوانتر بێت, دەیویست بڵێ مرۆڤەکان با بەیەك چاوو بێ جیاوازی تەماشای یەکدی بکەن, دەیویست هەڵۆ ئاسا بفرێ, وەك هەموو ئەو هەناسانەی دەیانەوێ بە ئازادی هەڵبفرن, دەیویست بڵێ با وەك مرۆڤێك رەفتارم لەگەڵ بکرێت, وەك خاوەن بیروڕا تەماشای جوانی مرۆڤایەتیم بکرێت, نەك بە چاوی چڵێس سەیری روخسارم بکرێت و بۆ بەرژەوەندی حەز بە ناسینم بکرێت, نا بمبورن تەنها ویست نەبوو, من هەڵەم, بەڵکو هەموو ئەم شتانەو ئەم ووتانە لە نێو چاوەکانیدا دەخوێندرانەوە, بەڵام هەموو کەس ئەو راستیەی نەدەبینی گەر بیانیش بینیبا بە درۆیان دەخستەوە.

لەو دەمەداو لە گەرمەی گۆرانی وتنی و خەیاڵەکانیدا جیڕەی دەرگاکە هات, لە پڕ دایکی دەرگاکەی کردەوەو گۆرانیەکەی بۆ تەواو کرد "خوایە شوکرم بە کاری تۆ قسمەت و نسیبم وابوو" پێی ووت: " ئاییییی دونیا ئەو گۆرانیەت چی بیر هێنامەوە, منیش کاتێ لەتەمەنی تۆ بووم خوم بەو گۆرانیەوە گرتبوو, خۆزگە هەر ئەو کات دەمردم"

ئەویش هاتە وەڵام لێی و ووتی: "نا دایە.. وتنەوەی گۆرانییەکی غەمبارو ژەنینی ئاوازێکی غەریب بە نۆتەی گەرو.. خوو نیە بەڵکو زەمەنێك, قەدەرێك, خەمگەلێك وا دەکەن, تۆ ئەو گۆرانییانەی بۆ بچڕی ئەویش بەدبەختی خۆمانە کە نازانین چی لە چارەی خۆمان بەدی دەکەین و چی مردنێکی ناشرین چاوەڕوانمان دەکات"

پاشان بیری کەوتەوە کە دایکی لە داخی ئەوەی تەمەنی لەگەڵ پیاوێك بردە سەر کە ئەو پیاوە نەبوو چاوەڕوانی دەکرد, رۆژانە ئەو گۆرانیەی دەوتەوە, تا رۆژێك باوکی زۆر هەستی پێ برینداربوو, پێی ووتبوو "چاوت

دەرەهات, بۆ بە دڵت نەبوو شووکردنت بەمن, خۆ کەس زۆری لێ نەکردبووی؟".
دایکی هەندێك بەدیاری سەریەوە وەستاو لێی پرسی
. تۆ چیتە.. ؟
. نازانم دایە لە گیانی خۆم زۆر بێزارم, ئارەزووی مردن دەکەم.."
هەرچەندە (ئەو) زۆری رق لەمردن دەبووەوە, چونکە دەیزانی کە "مەرگ" لە سۆزی دایك و لە خۆشەویستی هاوڕێکانی دووری دەخاتەوەو چاوەکانی پڕ دەکات لەخۆڵ, بۆ شاردنەوەی جوانی سروشتو ئاوێنەکەی کە هەموو بەیانیانێك دەچێتە بەردەمی بۆخۆ جوانکردن, گوێیەکانی کپ دەکات کە ئیدی نەتوانێ گوێ لە گریانی منداڵێکی هەتیو بگرێ.
لای (ئەو) مردن قەدەرێکی زۆر ناشرین بوو, چونکە دەیزانی میوانێکی ناوەختو بێ شەرمە, رێگە نادات خۆی ئامادە بکات بۆ ماڵئاوایی کردن لە رووناکیو پێشوازی کردن لە تاریکی, بەڵام ئەو رۆژە لە چاوەڕوانی زەنگی مۆبایلەکەیو لە داخی بێزارییەکەی ئارەزووی مردنێکی پێش وەختری دەکرد.
دایکی مشتێکی کێشا بە سینگی خۆیداو ووتی:
"خوانەکا کچم, بۆ ئەوەندە باسی مردن دەکەی..؟ گوێی شەیتان کەڕ بێ خوایە, خودایە جەرگی هیچ دایکێك نەسوتێنی, کچم هەستە دەست و دەمو چاوت بشۆو دەست نوێژێ هەڵگرەو شەیتان بە نەعلەت کە, دڵتەنگیت دەڕەوێتەوە, دە هەستە کیژم دە هەستە".
دایکی ئەوەندەی ووتو چووە دەرەوەی ژورەکە.

## بەشی دووەم

(ئەو) لە ژورێکدا هەموو خەونو ئاواتەکانی خڕ دەکردەوە, زۆر جار کە بێزار دەبوو شەڕی بە شتەکانی ناو ژورەکە دەفرۆشت, کە پێکهاتبوون لە کتێبخانەیەك و

رادیۆیەکی بچکۆلەو دۆلابێکی ئاسن, هەندێ گوڵدان‌و فارگۆنی بەتاڵیش لەسەر کتێبخانەکەی دانرابوون, کومبارێکی سوری خانە خانەش راخەری ژورەکەی بوو, هەندێ رۆژنامەیش لەنێو ژورەکەیدا بڵاوی کردبوونەوە, لەودەمەدا لە چاو بە خشاندە کومبارەکەی, چوار ساڵ بەر لەو رۆژەی بیرکەوتەوە, ئەو رۆژەی ئەو رایەخەیان لەبەر دەرگای ماڵ کڕی, خاوەن کومبار فرۆشەکە بە درۆی پارەی رایەخەکە زوو زوو چووبووە بەر دەرگایان تا بیبینێ, تا رۆژێکیان نە دایکی نەباوکی لەماڵ بوون, (ئەو)یش نیوەی پارەکەی دیکەی بۆ بردبوو دابویە دەستی, خاوەن کومبار فرۆشەکە توند دەستی گوشیبوو نوقرچێکیشی لە باڵی دابوو, سەرەڕای ئەوەی پیاوێ بە تەمەنیش بوو تەماحی لێ دابوو, (ئەو)یش تا توانی دەستی راوەشاندبوو پێی ووتبوو:

"ـ لاچۆ سەگباب جارێ تر بێیتەوە بەر ئەم دەرگایە ئابرووت دەبەم.

. بۆ تووڕە بووی کچی جوان چیم لێت کردووە..؟

. هێشتا ماوتە چاو حیز

ـ ناال قسەی وا مەکە رێزی خۆت بگرە من بە باوکت دەشێم

. باوك بۆ کچ هێندە ناوگەڵ برسی نیە"

کاتێك هۆشی گەڕاندنەوەی لای رابردوو بوو, ئێستای بیرچوبووەوە, لەو دیو دەرگای ژورەکەی, دەنگی براکەی هێنایەوە سەر خۆی, کە هاوار هاواری لە پەرداخێ ئاوی سارد دەکرد بۆی ببەن, حەسرەتێکی هەڵکێشاو هێشتاکە هۆشی دەستبەرەداری رابردووی خۆی نەببوو, رایەخ فرۆشەکەی لە بیر نەچوبوو, بزەیەکی بێزاریانەی هاتێ‌و چووە بەرامبەر ئاوێنەکەی کە لەسەر تاقی پەنجەرەکەی دانابوو بەخۆی ووت:

"زۆر سەیرە..!"

چەند لاپەڕەو پێنوسێکی هێناو کەوتە نوسینی وتارێك بەناونیشان: "با هیچ شتێك نەبێتە رێگری هەنگاوەکانمان"

لە وتارەکەیدا نوسی:

"ئەمجارەش خامەم هێنایەگۆ تاباس لەو گرفتانە بکات کەهەردەم بونەتە رێگری تەواوکەری کۆمەڵ, ئەو گرفتانەی کە ناهێڵن ئێمەی ژنان هەنگاوی نوێ بنێین, هەمیشە لە جێگای خۆمان دەخولێینەوە, هەڵبەتە چەند هۆکارێك هەیە کەبەر لەهەموو کەسێك خۆمان چاك

دەزانین چین و کامانەن ئەو کێشانەی لەکاروانی ژیان جودامان دەکاتەوەو بە جێ دەمێنین، بەشێك لەو هۆکارانەش (ترس و شەرم)ە کە بووەتە بەشێك لە ژیانمانداو کۆسپێك لەبەردەم هەنگاوەکانماندا، کە بەردەوام شکستی بەهەوڵەکانمان هێناوە، بەردەوام رووبەڕووی ئاماژە ترسناکەکانی کۆمەڵگە دەبینەوە، ترسمان لە ژیان، لەزمانی خەڵك، لەو ئابرووەی خێڵێکیان پێ بەستۆتەوە، لەو یاساو رێسایانەی پیاوو ئایین و عادات فەرزیان کردووە بەسەرماندا، هەروەها (شەرم)یش بەهەمان شێوە شەرممان لەراستی، لەخواستەکانمان، لەو شێرەی نەوەی نوێی پێ گەورە دەکەین، لەخۆمان....هتد.

ترس و شەرم.. بووەتە دوو هۆکاری سەرەکی لە ژیانماندا، تاکو ئێستا ئەمە واقعی ئێمە بووەو مرۆڤیش نابێ لەم رووبەروو بونەوەیەداو لە راستیەکان هەڵبێت، بەلاَم نابێ هیچ هۆکارێکیش ببێتە رێگری هەنگاوەکانمان، تاکو ئازاد ببین لە دەربڕینی خودی خۆمان.. لە ئایین لەبەرگ پۆشین.. لەگەڕان بەدوای راستیدا، ئێمە دەبێ زیاد لەپێویست لە کۆشش دابین و سڵ لە هیچ یاساولی شەرەفێك نەکەین تا دەگەین بەخواستەکانمان، دەبێ هەنگاوەکانمان چڕ بکەینەوە تابزانین چۆن هەنگاو دەنێین و چۆن لە گۆڕانکارییەکان دەدوێین، دەبێ شەرم لە خواستەکانمان نەکەین، بەردەوام هەوڵبدەین بۆ بەدەستهێنانی، ژنان نابێ خۆیان لەرەگەزی بەرانبەر بەکەمتر بزانن ئەم هەڵوێستانە پێویستە هەموو یەکێك لەئێمەدا هەموو مێینەیەك درکی پێ بباو کاری تێبکات، بۆئەوەی کۆمەڵ چیدی نەتوانێ بەچاوێکی کەم لێمان بڕوانێ و مافەکانمان بدات بەدەم ئاوەوە، ئەگەر پیاو ئایەتێك بێت لەشەریعەتەکانی ئاسمان ئافرەتیش فەرمودەیەك هەر بووە) .

دوای ئەوەی لە نوسینی وتارەکەی تەواو بوو کەوتە خوێندنەوەی بۆ کەسی ناو ئاوێنەکە، دەستە بچکۆکەکانیشی لەگەڵ ووشەکاندا بەسەمای دەهێنان، خۆ منیش بوونم هەبوو لەوێندەر بەلاَم ئەو زیاتر لەگەڵ کەسی ناو ئاوێنەکەی قسەی دەکرد.

"ئەو" دەمێك بوو گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە هۆکاری سەرەکی هەرە مەینەتیەکانی ژن لە دەستی خۆیەتی، چونکە پێی وابوو گەر بیَ و هاتبان لە باتی رێکخراوی ژنان و ئافرەتان، ئەو رێکخراوانەی کە داکۆکیان لە مافی رەگەزی مێینە دەکرد، رێکخراوێکی پیاوانیان دروست

کردبا, ڕەنگە گۆڕانێکی زیاتر روویدابا لە وڵاتەکانو هێندەش زەبرو زەنگو توندو تیژی بەرامبەر بە مێینە رووی نەدابا, بۆیە دەیگووت:
"ئێمەی مێینە هەموومان دەزانین کە کێشەکانمان چین, بەڵام چۆن بتوانین پیاوەکانمان لەو کێشەو مافانە ئاگادار بکەینەوە, کە ئێمە لەناو ڕێکخراوەکاندا تەنها لەگەڵ مێینەی وەکو خۆمان باس لە کیشەکانمان دەکەینو کۆڕو کۆبونەوەکانیش تەنها بۆ ژنان دەبەستین؟ کاتێکیش کە دەچینەوە ماڵەوە دەمانەوێ ژنسالارانە رەفتار لەگەڵ پیاوەکاندا بکەین کە خۆمان هەوڵی نەهێشتنی پیاوسالاری دەدەین, ئەی ئەگەر بێتو لە باتی ژنە فێمێنزمەکان چەند پیاوێکی ڕۆشنبیری وەکو (دادوەرێك, پزیشکێك, مامۆستایەك, کۆمەڵناسێك, دەروونناسێك), دابنێینو کە هەر یەکەو لەوانە شارەزاییەکی باشیان هەیە لە مافی رەوای ژنان, بە پێچەوانەی ئەوەی کۆبونەوە بە ژنان بکەن, کۆبونەوەو قسەکانو نوسینەکان بە پیاوان بکەنو تێیان بگەیەنن کە لە هەموو روویەکەوە مافەکانی ژنان چین کامانەن, پیاو ئەو کات باشتر تێدەگا ژن وەکو ئەو هێلاك دەبێتو زیاتریش, وەکو ئەو حەقی سەلماندنی بوونی خۆی هەیە, ئایە باشتر نیە وەك لەوەی ژن دانیشێ بەرامبەر بەژن باس لە کێشەکانی خۆی بکاتو نەگاتە هیچ سەرەئەنجامێك جگە لە رشتنی چەند تنۆکە فرمێسکێکو رق لە دڵ بەرامبەر بە پیاو؟ پێتان وانیە ئەو کاتە ئەو کێشانە نەمێنن کە ئێستاکە هەن؟ بە دڵنیاییەوە ئەو کاتە پیاوەکە دەگەڕێتەوە ماڵەوەو رەفتارێکی جوانتر لەگەڵ مێینەی ماڵەکەی دەکاتو یارمەتی باشتریشی دەدات, جا چ دایکی بێت یان خێزانی یان کچی یاخود خوشکی ".
سەری داگرتو دواتر ئاوڕێکی سەرنج راکێشی لە ئاوێنەکە دایەوەو ووتی:" من لە خۆڕا ئەم قسانە ناکەم, گەر ترسو شەرم نەبوایە روو بەرووی ئەو حاڵەتە نەدەهاتم, پیاوێك لە تەمەن باوکم حەز بکات دەست بازیم لەگەڵدا بکات, منیش لە ترسی زمانی خەڵکی نەتوانم هیچ قسەیەك بکەم نەبادا بڵێن: " پیاو گوناهی نیە کچە خەتا لە خۆیەتی" دڵنیام تاوانبارم دەکەن نەك من هەزارانی وەکو من رۆژانە توشی تەعدا لێکردنیش دەبن کەچی هەر ژنەکان تاوانبار کراون".
دایکی هاتەوە یاد کە لێی هاتە ژورەوەو بەو گۆڕانیەی دوبارەی دەکردەوە برینی پیێ کولاندەوە, وای بۆ دەچوو کە رەنگە دایکیشی کاتی خۆی وەکو ئێستای (ئەم)

بێزارو بێ تاقەتو دەست لە ئەژنۆ دانیشتبێ, بۆیە ئەو جۆرە گۆرانییانە هاتووەتە سەر زاری, بەڵام ووتی" ئەگەر بە بێزاریەوە ئەم گۆرانیەی ووتبێ ئەدی بۆچی ووتی"خۆزگەم بەو زەمەنە" کەس خۆزگەی زەمەنێك ناكات گەر خۆش نەبووبێ"

بە بێتاقەتیەکی زۆرەوە بە ئاوێنەکەی ووت:" ئەم بێزارییەی من دەردی ئەمڕۆم نیە..؟ من چوار وەرزەی ساڵ بێ تاقەتو ماتم.. ئەمڕۆ لە هەموو رۆژەکان زیاتر توشی خەمۆکی بوومە, هەر لە خۆمەوە شەڕ بە شتەکانی دەورو پشتم دەفرۆشم"

جا ئەو ژورەی (ئەو)ی لێ دانیشتبوو کە ژوری خۆی بوو هەموو سوچو بنمیچەکان بۆنی ئەویان گرتبوو, هەستا و دوگمەی رادیۆکەی تێکدا هێندەی بیسوڕێنێ, گوێبیستی شتێك نەدەبوو بتوانێ بێزاریەکەی خامۆش بکات جگە لە بەرنامە درۆ سیاسیەکان کە هێندەی دی توڕەیان دەکرد, چووە لای کتێبخانەکەیو یەکە یەکە کتێبەکانی دەرکردنو تەماشای ناونیشانیانی دەکرد بەڵکو یەکێکیان سەرنجی زیاد رابکێشێو خۆی پێ لە بیر بباتەوە, بەڵام کتێبەکانیش هێندە زۆر بوون بە تەنها دەرەقەتیان نەدەهات زۆر لەو گەورەتربوون, هەزارانی

وەکو ئەویان لە دێڕێکی نێو لاپەڕەیەکدا ون کردبوو, کتێبەکان بە هەموویانەوە چاوشارکێیان لەگەڵدا دەکردو پێی پێدەکەنین دەیانزانی کە سەری (ئەو) لە گەمەی چاوشارکێ دەرناچێو دۆڕاندن دەبێتە هاویاری.

لە نێو کتێبەکاندا کتێبێك سەرنجی زیاد راکێشا, رۆمانەکەی پاولۆ کۆیلۆ بوو "ڤیرۆنیکا بڕیار دەدات بمرێت" ئەم کتێبەی دوو جار خوێندبوووەوە زۆر جوانیش بوو لەلای, کەچی سەرەرای ئەوەش زۆر دڵگرانی دەکردو بەزەیی بە خۆیو شارەکەیدا دەهاتەوە کاتێ کۆتایی بە چیرۆکەکە دەهێنا, ڤیرۆنیکا ئەو کچەی لە داخی دوبارە کردنەوەی شتەکان بڕیاری دابوو بمرێت, چەند حەبێکی خواردبوو تا زوترە بیکوژێ, کەچی کاتێ هۆشی دێتەوە سەر خۆی لە نەخۆشخانەیەکی دەروونی بە تەك چەند کۆمەڵە شێتێك پاڵکەوتووە, ڤیرۆنیکا دڵنیابوو لەوەی شێت نیە بەڵام بۆ چارەسەر بردبوویانە وێ.

ئەو کاتانەی خەریك خوێندنەوەی ئەو رۆمانە دەبوو, نامۆ بوو بە ژیانی ڤیرۆنیکا, کەچی لە خوێندنەوەی هەموو رۆمانەکانی دیکەدا ئەو دەبووەوە پاڵەوانی چیرۆکەکە..

کەچـی لەوەیانـدا نـا چـونکە لـە وڵاتەکـەی ئـەودا نەخۆشخانەی دەروونی دەگمەنە شێتخانە نیە, ڕێـز گرتن نیە, ڕێز لە مێشکە پڕ لە عەقڵەکان ناگرن چ جای شێت, بەڵام لـە شارەکەی ڤێرۆنیکادا شێتەکان دەبەنە شوێنی تایبەتو بە ئالـەتی مۆسیقا چاکیان دەکەنـەوە, بەڵام لـە وڵاتەکەی (ئەو)دا ئەگەر بیانەوێ شێتێك چاکبکەنەوە بە زنجـیرو کەلەپچـە دەیبەسـتنەوەو بـە کێبـڵو دار لێیـان دەدەن گوایـە عاقڵیـان دەکـەنو چـاکیان دەکەنـەوە, بـەو زنجیرو لێدانە هێندەی دی شێتەکە شێتتر دەکەن, ئێمـەی عاقڵ ئەگەر لێمان بدەن شێت دەبین جا دەبێت لێدان چی لـە شـێت بکـات, قسـەی خـۆشو مۆسـیقا لـە شـارەکەو وڵاتەکەی ئەودا نەبوو بۆ شێتەکان, کەچی هـەموو ئەمانـە لە شارەکەی ڤێرۆنیکادا هەبوون, دەیووت:

"شـێتەکانی شـارەکەی مـن لەسـەر شـەقامەکان کـەوتوون ئەو کەسانەی خۆیان بە هۆشیار دەزانن گاڵتە بە شێتەکان دەکـەن, یـان لـە دواوەوە بزیـان پـێ دەکـەن, یـان بـە شـێتە شێتە توڕەیان دەکەنو فێرە بەرد بارانیـان دەکـەن, نـازانن کـە ئـەوانی شـێت زۆر لـە ئێمـە هۆشیارترن, ئێمـەی عاقڵ لەهجەیـەکمان نیـە بـۆ قسـەکردن لەگـەڵ خـودا, کەچـی شـێتەکان ڕۆژانـە قسـە لەگـەڵ خـودا دەکـەنو گەمەشـی لەگەڵدا دەکەن گاڵتە بە عەقڵی منو تۆش دەکەن".

ناچار ڕۆمانەکەی خستەوە شوێنەکەی خۆیو تـوڕە بـوو, بە کتێبەکانی ووت:

"ئیدی ناتانخوێنمەوەو گەمەشتان لەگەڵدا ناکەم".

دەستەکانی گرت بەناو قەدیـەوەو بە ڕۆخسارێکی ماتو غەمگین سەیرێکی مۆبایلەکەی کردەوەو لەخۆی پرسی:

"بۆ لێنادا..؟ بۆ زەنگ نایات..؟"

دواتـر ئـاخێکی هەڵکێشـاو سـەری هـەڵبڕی, بـە نیگاکـانی جـەنگی لەگـەڵ دیـواری ژوورەکەیـدا دەکـردو دەیویسـت بیڕوخێنێت, ئەو دیوارەی چەندین بڕوانامـەی ڕێـز لێنـانو سوپاسنامەکانی ئەوی بە خۆیدا هەڵواسیبوو تـا سـیمای خـۆی جـوانتر بکـات, بـە دەسـتی چـەپی پەرچـەمی هەڵدایەوە کە هاتبووە سەر چاوە خومارەکانیو ووتی:

" کـێ لـەم ژوورە لەگەڵمدایـە گـوێم لێ بگرێـت, تەماشـاکە دیوارەکە بانگم دەکات, گوێت لێیە چیم پـێ دەڵێت..؟ ئـا پـێم دەڵـێ "وەرە لای مـن.. مەچـۆرە لای کتێـبو رادیـۆو ئاوێنەکـەت, ئـەوان تۆیـان خۆشـناوێت, تـەنها مـن نـەبێ, وەرە بزانـە چـەندم خۆشـدەوێی.. ئـەوەتانێ هـەموو بڕوانامـەکانتم بـە سـنگما هەڵواسـیوە تـا هـەر کەسـێ

سەردانی ژورەکەی کردی بزانێ چەند شایەنی ڕێز لێنانی".

من لە دڵی خۆمدا ووتم: دیوارەکەش خۆشی دەوێت و بۆی دەدوێت خۆزگەم بە خۆی، پێ ئەچوو گوێی لە ڕۆحم بوبێت بۆیە بە توڕەییەوە ووتی: "نەخێر درۆ دەکات منی خۆشناوێ، ڕاستە قوتابیەکی گوێ ڕایەڵە، بەلاّم هەرچییەکم لێ ببینێ لەگەڵ شەو دادێ دەیداتەوە بە ڕووما، خوا نەکا بچمە پاڵی، ئەی نازانی هەر دیوارە دەڵێ:

"گەر من نەبم ناتوانی خۆت ڕووت بکەیتەوە، ناتوانی بە تەلیفۆن حەزەکانت لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا بەش بکەیت، ناتوانی ڕاستیەکان ئاشکرا بکەیت، من دیوارم دیوار، هەزاران شتی باش و خراپ دەشارمەوە، تەنانەت ئەو کەسانەی جوامێرەکانیش دەکوژن و لەگەڵ ژنەکانیان ڕادەبوێرن لە پشت منەوەن، ئەوانەی گیرفانیان پڕ دەکەن لە هەموو شتێك و دزی دەکەن و باکی سك برسیان نیە ئەوەتان لە پاڵ منەوە خۆیان حەشار داوە، ئەوانەی بەشەوان تلیاك دەخۆن و دەخۆنەوەو بوختان و قسەش بەخەڵکی دەکەن و بە ڕۆژیش دەبنەوە بەمەلاو موفتی ئەوانیش ئەوەتان.. منیان کردووتەوە پاسەوان، ئەمانەو چەندین کەسی دیکەش عەیب و عاریانم داپۆشیوە، چەندین کەسی بەستەزمانیشم دیل کردووە، چەندین ژنم لە چوار ڕوخساری خۆمدا خنکاندووە، لە هەمان کاتیشدا بوومەتە سایەو سێبەری چەند کەسێکی دیکەش، من هەموو ئەم ڕاستیانە دەبینم و دەزانم بەلاّم هەر کە دروستیان کردم زمانیان بڕیم بۆ ئەوەی نەتوانم هیچ قسەیەك بکەم.. چونکە شت و کارە خراپەکان زیاتر لە پشتی منەوە دەکرێن، کارە جوانەکان و مرۆڤە جوانەکان پیویستیان بەمن نیە، ئەوان بوون ئەوان، مرۆڤە ناشرینەکان بوون زمانیان بڕیم بۆ ئەوەی ئابروویان نەبەم کە نیانە".

"مێشکی بردووم، تۆ لەمن باشتر دەزانی کە تەنها کەسێك نیم خاوەنی بڕوانامە بم تا بچم بە حەسرەتەوە تەماشای بڕوا نامەکانی خۆم بکەم، گوێ لەم هەموو قسانەش بگرم کە هێندەی دی بێزارم دەکەن لە بوون".

من چوبومە بەرگی ئاوێنەکە، تا لەوێندەر بتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم و ئەویش بمبینێ، بەپەلە هێدیم کردەوەو پێیم ووت:

"چیە پێدەچێ شێت بوبیت..!"

ئــاخێکی هەڵکێشــایەوەو دەســتی درێــژ کــرد بــۆ هەفتەنامەیــەك بیخوێنێتــەوە, تــاوەکو خــۆی پێــوە بخلافێنــێ، بەرامبــەر بــەمنی ئاوێنــە دانیشــت و کەوتــە خوێندنەوەی هەفتەنامەکەو گفت لەگەڵمدا:

"ئــەم هەواڵانــە دە جــار گــوێم لــێ دەبــێ پاشــان ئــەم هەفتەنامەیــە دایــدەگرێ، بــزانم لاپــەڕەی دووەم چــی تیایە..؟ هیچی وا نیە..! لاپەڕە سێ تۆ سەیر ئەڵاااااا تو سەیری ئەو کچە جوانە کێیە..؟"

مـن نەمـدەزانی چیەو لەگـەڵ کێیـەتی چـونکە نـاوەڕۆکی هەفتەنامەکە بە باشی لەمنەوە دیار نەبوو، ئەوەندەی دیار بوو بە پێچەوانەوە هەندێ لە دێڕەکانم دەخوێندەوە لـە نێـو ئاوێنەکـەدا، بۆیـە ئـارەزووم بـوو بپرسـم کـام کـچ، پێکەنی و ووتی:

"بـەخوا ئێمـەی مێینـە سـەیرین ئیرەیـی بـە کچـی جـوان دەبـەین، حـەز ناکـەین هـیچ مێینەیـەك لـە خۆمـان باشـترو جوانتر بێت, گەر دایکیشمان بێت هەوڵ دەدەین سـەرنجی باوکمان بەلای خۆماندا زیاتر رابکێشین".

منیش هەروا بووم, بە ئاهورا مـەزدا حـەزم نـەدەکرد هـیچ کچێ لەمن جوانتر بێت، ئـاخر کـاتێ ئـەم نەخۆشیە لـەلای ئێمـەی مێینـە دروسـت دەبـێ لـەخۆڕا نیـە، نێرینـەی ئـەم ولاتە گەر ژنەکەی یان دەستگیرانەکەی لە بەرگی مـانگیش خەلق کرابێ, هەر کە لەگەڵ کچێ جوانتری بینـی پەنجـەرە بە رووی تریفەی ئەوەی دیکە دادەخات.

(ئەو) دڵنیا نەبوو لە بوونی من سـەرەڕای ئـەوەیش قسـەی بـۆ دەکـردم چـونکە دەیزانـی رۆحێـك لەوێنـدەر گـوێی لێ دەگرێـت، تارماییەکـەم بـە دەوری پشـتیدا دەخولایـەوە، هەستی بە هەموو جوڵانەوەیەکم دەکرد، گوێی لـە هـەموو وتــەکانم دەگــرت، هەرچــەندە هیچــم لــە بــارەی چــیرۆکە سەیرەکانی (ئەو)و ژورەکـەی ئـەو نـەدەزانی, مـن تـەنها لـە ژورەکـەی ئـەودا گـوێگرو بینـەر بـووم، کـاتێ سـەرقاڵی بیرکردنـەوەی ئـەوە بـووم چـۆن پێتـانی بڵـێم کـە مـن تـەنها گـوێگرو بینـەری ئـەو بـووم لـە ئاوێنەکـە هاتبوومـە دەر، (ئـەو) دێڕێکـی ووت و نیشـانەی سـەیری لـە کۆتاییـدا بـۆ جێهێشتم پاشان ووتی:

" تەماشـا ئـەم لاپەڕەیـە بابـەتێکی تیدایـە بـە ناونیشـان (غوربەت و نامۆ بوون) ئاییییییی چیم بیرکەوتەوە..!"

چـومەوە نێـو ئاوێنەکـەو کەوتمـە قسـەکردن لەگەڵیـدا, چونکە زیـاتر تەماشـای ئاوێنەکـەی دەکـردو قسـەکانی بـۆ ئاوێنەکـە دەگێڕایـەوە، بۆیــە مــن بوومــە کەســی نــاو

ئاوێنەکەو قسەم  لەگەڵدا کرد تا بزانم لەو هەفتەنامەی بە دەستیەوە بوو چی خوێندەوەو چی بیرکەوتەوە، ووتی:
"شێتەو نامۆ"
شـێتەو نـامۆ دوو کەسـەی دی نێـو ئـەم بابەتـەن کـە لـە سەرەتا ئاماژەم پیٚ کردن، بەڵام من ئەو کاتەی چووبوومە رۆحی ئاوێنەکە نەمزانی شێتەو نامۆ کێن, بۆیە پرسیاری ئەوانم لیٚ کردو ووتم:
لە رۆژێکدا دە جار ئەو دوو وشەیە بەکار دەهێنی کەچی ئێستا کردتن بە ناو..!
ووتی:
" بـا چـیرۆکی شـێتەت بـۆ بگێڕمـەوە، چـیرۆکێکی راسـتەقینەیەو درۆی تێدا نیە، شـێتە بـۆمنی گێڕایـەوە منیش بۆتـۆی دەگێڕمـەوە، تـۆش کـەیفی خۆتـە، ( شـێتە) وەکو ئێستام توشی شۆك هاتبوو، ئێسـتا هـەمان مێـژووە دووبـارە بووەتـەوە لای مـن و تـۆ، بـەڵام هـی ئـەو هەنـدیٚ جیـاوازتر، چـونکە شـێتە بەتـەنیا لەژورەکـەی خـۆی بـوو، کەسی دووەم نادیارو ئاوێنەیشی نـەبوو، لـە ئێسـتای مـن بێزارتـر بـوو رێکـەوت خوشـکەکەی رۆژنامەیـەکی هێنـابووەوە مـاڵیٚو (شـێتە) لێـی وەرگرتبـوو خوێندبوویـەوە، پاشان شـێتە خـۆی وەك حیکایـەتخوانێك بۆی گێڕامەوە"

من خـۆم نـازانم مەبەسـت لـە حیکایـەتخوان چیە لەوێنـدەر لـەو ژورە، هـەموو شـتەکانو هـەموو چیرۆکەکان ئـەو بـۆ ئـەوو ئـەویش بـۆ یـەکیٚ دی دەگێڕایـەوە، تـۆش وەك مـن گویٚ بگرە بزانە شێتە چی دەڵیٚو چی دەگێڕێتەوە..!

شێتە:
"لە دوا لاپەڕە دەستم بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە کرد, هەرچەندە مانگی دوو جاریش دەردەچوو بەڵام من پێی دەڵێم ڕۆژنامە چونکە ناخۆشە بڵێی نیو مانگی، ڕۆژنامەکە لاپەڕەکیان تایبەت بوو بە (ستونی ڕازەکان) هەر ناوی لاپەڕەکە (ستونی ڕازەکان) بوو, کۆمەڵێك نامەی ئەویندارانی لە خۆ گرتبوو, یەکە یەکە نامەکانم خوێندەوە.. هەموو ئەو کەسانەم دەناسی کە نامەکانیان نوسیبوو تەنها یەکێکیان نەبێ ناوی "نامۆ"بوو نامەکەیشی زۆر جوانو سەرنج ڕاکێش بوو, دوای ئەوەی نامەکەیم خوێندەوە بەخۆمم ووت:
کەسێکی چەند ئەویندارە, کە وابێ لە خوداوە زۆر نزیکە.. هەر لە خۆمەوە چوومە نێو گەڕەکی خەیاڵو کەوتمە پیاسە کردن بە کوچەکانیدا, تا شێوەی نامۆ بهێنمە بەرچاوی خۆمو بیکەم بە هاوڕێم، وەك خۆی لە نامەکە دەڵێ ئەمە یەکەمین نامە نیەو دوایین نامەشی نابێ بۆ خۆشەویستەکەی بنوسێت، کەوایە با بە دووی ژمارەکانی دیکەی ئەو ڕۆژنامەیە بگەڕێم دەمەوێ بزانم چی دیکەی نوسیوە.. بەڵکو منیش کۆپی بکەمو بۆ خۆشەویستەکەی خۆمی بنوسمەوە, بەڵام ناوی ئەو بێنمو ئاماژەی پێبکەم کە لەوەوە وەرمگرتووە یان منیش لە شوێن ناوی خۆم دەنوسم "نامۆ".
کۆمەڵێك پرسیاری سەیرم لە لا دروست بوو نامۆ.. نامۆ.. نامۆۆۆ.. نامۆ کێیە..؟ بۆچی وا سەرقاڵی کردم بە خۆیەوە..؟ تۆ بڵێی شێت نەبوبێتم چونکە لە هەموو ڕۆژەکان زیاتر سەرقاڵی بیرکردنەوەی شتی هیچو پووچم..؟ ئەو ڕۆژەم بە خوێندنەوەی نامەکەی نامۆ بەسەر برد.. دەمویست بزانم چی لەو دیوی وشەکان حەشار داوە.."

(ئەو) زیاتر شارەزای شێتە بوو، بۆیە لەم گێڕانەوەیەدا بۆ ماوەیەك من وون دەبم (ئەو) خۆی دەبێتە حیکایەتخوانو خۆیو شێتە چیرۆکە سەیرەکانی خۆیان دەگێڕنەوە، منیش وەك تۆ گوێ دەگرم.
(ئەو) ووتی:
"جا وابوو ( شێتە) لە هەموو ڕۆژەکان زیاتر خەفەتی هەبوو هەر بۆیە بە مەراق بوو نامۆ بناسێ, دەستی بە خوێندنەوەی ئەو نامەیە کرد کە نوسەرەکەی نەدەناسی:

"خۆشەویستم..
نازانم چیت پێبڵێم.. باسی چیت لەلا بکەم خۆمن لە هەموو ساتێکدا بە کۆمەڵێ حەسرەتەوە یادت دەکەم, ئەو حەسرەتانەی.. لە حزوری بێ ئاگاییتدا لە ناخمدا گڕ دەسێنن, بەردەوام بیر لە کاتێك دەکەمەوە تۆی تیا ببینم, بیر لە لەهجەیەك دەکەمەوە پێی بدوێم بۆت, چونکە تۆی لەفریشتەو منیش مرۆڤێکی ناشرین, ناتوانم وەکو خۆی تێتبگەیەنم چەندم خۆش دەوێی.! چۆن ببمە پەرییەك و پێت بڵێم: ژیانم بەتۆوە بەندە مەحاڵە هەناسەدان بەبێ تۆ گوڵی تەمەنم لە باخچەی ئەویندا بە تۆوە جوانە بێ گومان بە گەر تۆ نەبی پەڕە پەڕە سیس دەبێت و هەڵدەوەرێ، بە بێ ئاگایی خۆم, فرێمتدایە دەریای عەشق.. ئەی نەتدەزانی مەلەوان زان نیم..؟ ئەوەتانێ شەپۆلەکان خەریکە دەمخنکێنن, نا هیچ نازانی..! دڵنیام گەر بتزانیبا چەندم خۆشدەوێی نیمچە ئاوڕێکی سۆزت لێ دەدامەوەو.. پەنجەرەی خۆشەویستیت بە رووممدا دەکردەوە, خۆ رەنگیشە باش بزانی بەڵام نەتەوێ بەسەر خۆتدا بهێنی, نەبادا بکەویتە بیری ئیرەیی و گومان و زوڵخایەك نەبێ لە جوانیت بڕوانێ یان رێنەدەی کچێکی گەمژەی وەکو من هەراسانت بکات, لە پەناگەی رۆحیەتی عەشقی خۆیدا ونت بکات, لە جیهانی سۆزو خۆشەویستیدا فریوت بدات, خۆشەویستم وەك بزانی ئەمە یەکەم نامەم نیەو دوایین نامەشم نابێ بۆتی بنوسم, خۆ هەموو نامەکانیشم لەیەك دەچن.. چونکە لە دەسپێکی هەموویاندا بە خۆشەویستم دەسپێدەکەم هەر بەو وشەش دەینێمە زەرفی دڵو بە پۆستی خۆشەویستی بە دەستی شەماڵێکی ئەویندار بۆت دەنێرم خۆشەویستم.
ناموٚ"

ئەو رۆژە ببوو بە کاتژمێر سێ‌و نیوی شەو جا شێتە خەوی لێکەوتبوو, بەدەم خەوەوە تا رۆژ ببووەوە وڕێنەی کردبوو، کاتێ رۆژ هەڵات تیشکی هەتاو لە پەنجەرەی ژورەکەیداو هاتە سەر سنگیو, بە ماچ هەڵیساند, کەچی پێدەچوو هێشتاکە ناوی ناموٚو وشەکانی ناموٚ بە هارمۆنیایەکی ناسك لە گوێچکەو هزریدا بزرینگێنەوە.
من نازانم جوان بیگێڕمەوە..! شێتە خۆی جوانتر دەیگێڕایەوەو دەیووت:
" ئەو رۆژە وەکو هەموو رۆژانی تر جوانترین جلم کردە بەرمو ماکیاژێکی کاڵم کردو دەرچووم لە ماڵ، خۆم سەرقاڵ کرد بە کاری دەرەوە، ئیدی خۆشم بیر چووەوە,

من هەر وام قەسەم بە چاوی تۆ هێندە ئاڵۆسکاوم خۆیشم بـۆ ناکرێتـەوە تـا بـزانم لـە کـوێی کارەکانـدا خـۆم دەدۆزمەوە".

(شـێتە) ئـەو ڕۆژە دوای تـەواو بـوونی کارەکـانی کاتـژمێر یـەك و نیـوی نیـوەڕۆ بـوو چـووە ئـەو بارەگایـەی (خولیـا) کاری لێ دەکرد، خولیا خوشکی شێتە بوو بە سێ ساڵ لـەو منـاڵتر بـوو کچـێکی زۆر زیـرەك و گـورج و گـۆڵ بـوو، دانیشـتنی نـەدەزانی, سـپیلکانەیەکی بـاڵا بـەرز لـە شـێتە جـوانتر ئـەو بـوو, بـە فشـە بیری لـە ژیـان دەکـردەوە, لـەو ئاسودەتر دەژیا زۆر جار شـێتە خـۆی ئیرەیـی پـێ دەبـردو دەیووت:

"بریا منیش بمتوانیبا وەك خولیا بژیم بەڵام ئەفسوس".

( شێتە ) ڕۆژانـە دەمـردو دەژیـاوە, دڵـی لـە بـاڵی پەپولـە بـوو، لەگـەڵ فـووت لێـی بکردایـە یـان بـە ئەسـتەم دەسـت بەری بکەوتایە لە فڕین دەکەوت بەڵام خولیای خوشکی بە پێچەوانەوە.

من لـە نێـو ئاوێنەکـە دانیشـتبووم گـوێم لـەم حیکایەتانـە دەگـرت کـە جـارێ (ئـەو)و جـارێکیش (شـێتە) لـە زەمـانی ئـەوەوە دەیگێڕایـەوە، لـەپڕ قسـەکانی بـڕیو ئـاوڕێکی دیکەی لەلایە ڕاستی دایەوە کە مۆبایلەکەی لێ دانابوو، دەمزانـی لێنـەدانی زەنگـی مۆبایلەکـە بـێ تاقـەتی دەکـات بۆیە ویستم بیری ببەمەوەو پێیم ووت:

ئێ باسی شێتەم بۆ بکە

شێتە دەیووت:

"مـن و خولیـا زۆر هـاوڕێین، تیکەیـەك نـان بـە بـێ یەکـدی قوت نادەین هـەر پێکـەوەش دەڕۆینـەوە مـاڵێ، نـە مـن دڵـم دێ ئەو بەجێ بهێڵم نە ئەویش, بەڵام کە منداڵ بووین وا نەبووین, بەڵکو زۆر ڕقمان لە یەکدیش دەبووەوە"

کە لە (شێتە)م پرسی چۆن..؟ ووتی:

"سەرت سوڕ نەمێنێ ئێستا پێت دەڵێم چۆن و بۆ..؟!

خولیـا کـە منـداڵ بـوو دایکـم فێـری کردبـوو چاودێری مـن بکات پێی وتبوو:

من لەماڵ نیم خولیا.. ڕۆژ تا ئێوارە کۆڵم بە شانەوەیەوەو بۆ پارویـەك نـان ئێـوەی پـێ گـەورە بکـەم چـی سـەگی ئـەو دێهاتانـە هەیـە بـەخۆمیان دەوەڕێـنم، (شـێتە)ش گـەورە بـووەو لـە تەمـەنێکی زۆر ناسـکدایە ئەگـەر چـووە دەرەوە یان سەربان یانیش قسەی لەگـەڵ کـوڕی کۆڵانـدا کـرد پێم بڵێی کچێ, دوایی شتێك ببیستم و تۆ پێت نـەوتبێتم لێت دەدەم و تیتکت بەسەرەوە نایەڵم".

خولیا لەو قسانەی دایکم ترسابوو لە خۆڕا قسەی بۆ دروست دەکردم قەسەم بە خوا هیچیشم نەکردبوو, ڕۆژ نەبوو دایکم نەگەڕێتەوەو قسەی ساردو سوکم پێنەکات, ڕۆژ نەبوو بە دەستی باوکم بە لێدانم نەدات، زۆر ڕقم لە دایکم دەبووەوە کە وای لێدەکردم، ئاخر هیچم نەکردبوو, بەڵکو خوشك‌و براکانیشم بۆی گەورە کرد، هەر خۆم بە تەنیا ئیشی ماڵەوەو دەرەوەم بۆ دەکرد، تەمەنم 10 ساڵان بوو لە قوتابخانە دەگەڕامەوە بەفرو باران بەخوڕ دادەباری من لەسەر جادەکان جلیکانەی بەنزین‌و نەوتم دەفرۆشت، تەمەنم بوو بە 12 ساڵ کە تازە خەریك بوو سنگم بەرز دەبووەوەو هەڵمدەدا.. لەناو گەراجی وەستانی ئوتۆمبێل بە " یەڵلا مای بارد" ئاوی ساردم دەفرۆشت قاڵبی بەفرم دەکڕی بە هەشت دیناڕو لە سەتڵێکدا ئاوم سارد دەکردو پەرداخی بە ڕوبعێك دینارم دەفرۆشت، چی سوکایەتی دونیاش هەبوو پێم دەکرا, سەرەڕای ئەوەی خۆم کردبووە کوڕو کلاوێکم لەسەر نابوو پرچە درێژەکەمم تیا شاردبووەوە، بەلام هەر دەیانزانی کچم, تا ڕۆژێکیان پیاوێکی ناشرین کە لێخوڕی یەکێ لەو ماشێنانە بوو کە خەڵکی پێ دەگواستەوە بۆ شارێکی دی پێی ووتم:

ـ تۆ کوڕی..؟

ـ بەڵێ کوڕم

دەستی درێژ کرد بۆ سینگم‌و ووتی:

ـ ئەی ئەو شەمامانە چیە بە سینگتەوە..؟

دۆلکە ئاوەکەم کرد بەسەرو دەم‌و چاویاو بە گریان گەڕامەوە ماڵێ‌و وازم لە ئاو فرۆشتن هێنا، لەتەمەنی 13ساڵیدا بە تەشتی گەورە هەویرم دەشێلاو بەو چلەی هاوینە بە دیار سێڵەوە نانی تیریم بە کرێ بۆ خەڵك دەکرد، ئیشی بەرگ دوریشم کرد ناوکە خورماشم دەرەکرد بە 75 دینار، لەتەمەنی 14ساڵی دەچووم بۆ دەشت پاقلەو تەماتەم دەڕنی بە 65 دینار، تەنها لەبەر ئەوەی دایك‌و باوکم لێم ڕازی بن‌و بەهەشتی خوا بەدەست بێنم کە دەیانوت لەژێر پێی دایك‌و باوك دایە، ئێ ئیدی لەوە زیاتر چی؟ نەمدەزانی هۆکاری توڕەبوونی دایکم لەچیەوە سەر هەڵدەدا, هەرچەندە ناچار نەبووم ئەو ئیشانە بکەم ئەوانیش زۆریان لێ نەدەکردم بەلام حەزم دەکرد دەخیلەی خۆم هەبێ‌و ئەوانیش هەست بە ماندوو بوونم بکەن‌و خۆشیان بوێم, هەروەکو چۆن براکەم ڕوبعێکی من ئیشی نەدەکردو جا بەهەردووکیانەوە سوێندیان بەسەردا دەخوارد, سەرەڕای ئەوانەش هیچ کات لێم ڕازی نەبوون، ڕۆژێکیان زۆر گریام, ژنە

دراوسێکەمان کە ناوی (نازەنین) بوو بە بێ ئەوەی لە دەرگا بدات هاتە ژورێو منی بینی دەگریم.. لێی پرسیم:
"چیتە بۆ دەگری..؟"
پرسیم نازەنین کێ بوو..؟ ووتی:
" نازەنین"خان لەگەڵ دایکی (شێتە) ئیشی دەکرد, هەر چەندە پیاوەکەی ئەو وەك باوکی شێتە نەخۆش نەبوو تا بڵێم ئەویش وەك دایکی دەیەوێ یارمەتی ماڵەوەو پیاوەکەی بدات, بەلاَم پیاوێکی گەمژە بوو (نازەنین) دووەمین ژنی ئەو بوو، چەند منداڵێکی لە ژنەکەی دیکەی هەبوون لە لای خۆی دەژیان، نازەنین خانیش.. وەك دایکێکی بە وەفاو وەکو منداڵی خۆی بە خێوی دەکردن هێشتاکەش منداڵەکان رقیان لێ دەبووەو سوکایەتیان پێ دەکرد، کوڕە گەورەکەی پیاوی کە ناوی (شالیار) بوو دەمو چاو درێژێکی سیلاوی بوو, رۆژ نەبوو شەڕ بەو داماوە نەفرۆشێ پێی دەیووت:
"حەدت چیە جێی دایکمان لێ دەگریتەوە, تا زوترە تەلاَقی خۆت لە باوکم وەرگرەو ملت بشکێنەو بڕۆ وازمان لێبێنە, ئێمە دایکمان مرد کەس ناتوانێ جێی ئەومان بۆ پڕبکاتەوە".

نازەنین خانیش دەسەلاَتی هیچ شتێکی نەبوو جگە لە گریان، رۆژانە دەچووە لای دایکی شێتەو گلەیی لەبەختی خۆی دەکرد ئیدی رۆژ نەبوو ئەم دوو ژنە وەك هەموو ژنانی دی دوو بەدوو باسی نەهامەتیەکانی خۆیان و خراپی پیاوەکانیان نەکەن بۆ یەکتری" .

وەیشش چەند بەستەزمانە..! من لە نێو ئاوێنەکەدا بەزەییم بەو ژنەدا هاتەوە، (ئەو)یش چاوەڕێی بوو پرسیارێکی لێ بکەم، ووتم: ئێ شێتە بە (نازەنین)ی ووت هۆی گریانەکەی چی بوو..؟ ووتی:
" بەڵێ.. شێتە ووتی:
مەسەلەکەم بۆ نازەنین گێڕایەوە کە دایکم ماوەیەکە توندو تیژە.. نازەنین خان ووتی:
. چیت هەیە لەگەڵ کوڕی ماڵەکەی پشتەوە..؟
. کام کوڕ..؟
. کوڕە گەورەکەی مام نوری
. هیچ.. بۆ..؟
ـ خولیا بە دایکتی وتووە کە رۆژ نیە نەچیتە سەربان و چاو چاوێنەی لەگەڵدا نەکەی.

منیش هەر کە گوێم لەم قسانە بوو خەریك بوو ئەوەندەی دی شێت دەبوم چونکە تاوانێکم نەکردبوو.. ئەو کورەشم نەدەناسی کە نازەنین خان باسی دەکرد، من هێندەی سەر قاڵی ئیشی ماڵەوەو خەریك ژێر کردنەوەی برا بچکۆلەکەم بووم کە تەمەنی دوو مانگ بوو بە شیری قوتو گەورەم کرد، هێندە نەمدەتوانی بچمە سەربان بۆ جل هەڵخستن نەبێ, تەنانەت پرچی خۆیشم بۆ شانە نەدەکرا، نازەنین کە زانی رەنگم تێك چووەو خولیا بە درۆ ئەو قسانەی بۆ دایکم گێڕابووە پێی ووتم:

. دایکت نەزانێ من گێڕاومەتەوە بەڵام پێی دەڵێم کە هەر لە خۆیەوە گومانی خراپت لێ نەکات تا شتەکان بە چاوی خۆی نەبینێ.

. بۆ تاوانە گەر سەیری کوڕێکیشم کردبێ..؟

ـ تۆ منداڵی هیچ لەم شتانە تێناگەیت, دایکت تەمەنێك ژیاوەو دەزانێ پیاو بایی چەندە, بۆیە لێت دەترسێ کچم, دڵگران مەبە حەقی خۆیەتی.

هێندەی دی دەستم کردە گریان سەرم نایە باوەشی

. هەستە هەستە دەمو چاوت بشۆو براکە بچکۆلەکەشت دەگری بڕۆ بزانە ژێر خۆی پیس نەکردووە..؟

نازەنین خان نەیدەزانی ناخی من چۆن بووەتە کورەی ئاگرو دڵمی تیا دەتوێتەوە, بۆیە چاوەڕێم کرد تا لە خولیا لە قوتابخانە گەڕایەوە, هەر کە گەیشتە دەرگا بە پرچ تا ژورەوە رامکێشا:

. بۆ هەر لە خۆتەوە بوختانم بۆ دەکەی..؟

. دایکم ووتی

. دایکم چی ووت..؟

. ووتی هەر چیەکی کرد پێم بڵێ

. ئێ چیم کردووە تا بۆی بگێڕیتەوە..؟

. هیچ

. ئەی چۆن ئەم قسانەت بۆ دەگێڕایەوە

. کاتێ لە کار دەگەڕایەوەو تۆ خەریکی نان ئامادە کردن دەبووی بانگی دەکردمە هۆڵەکەو  پێی دەووتم:

"ها من لە ماڵ نەبووم خوشکەکەت چی کرد..؟"

منیش نەمدەزانی چی بڵێم ناچار ئەو قسانەم دەکرد تا رۆژانەکەم زیاتر بداتێ کە زۆر جار نەشیدەداپێم.

زۆر بێتاقەت بووم, کەوچکێکم بەدەستەوە بوو تا توانیم راموەشاند بۆ خولیا, دای لە تەوقی سەری‌و خوێن بە بالایدا هاتە خوارەوە".

هەر لەگەڵ باسی خوێن هاتە ناو چیرۆکەکە من هەر لەخۆمەوە تێك چووم ووتم: وی.. کە باسی خوێن دەکەی موچوڕکە بە گیانما دێت..! خوێن ئەو رەنگە سورەی لەبەر چاومان ون نابێ, هێندەمان بۆنی خوێن کردووەو هێندەمان لێ کوژراون و خوێنیان لەبەردا رۆییوە ئێستاشی پێوە بێ چاومان بەدووی رەنگی سوردا وێڵە، نازانم چ فەلسەفەیەك لەو رەنگەدا هەیە، زۆر جار هاوڕێکەم پێی دەووتم:

"سێوێکی زەردو سور دانێ هەر چەندە سێوە زەردەکە خۆشترە کەچی دەست بۆ سورەکە درێژ دەکەیت و دەیخۆی یان گەر هات و باسی گوڵ بکەین یەکسەر بە خەیاڵ گوڵێکی سوور دێتە پێش چاومان کە چەندان گوڵی رەنگاو رەنگی دیکەشمان هەن، هەناریش شەقی دەکەین سور نەبێ نایخۆین, بمانەوێ دیاریش بۆ هاوڕێ و خۆشەویستەکانمان ببەین بە رەنگی سور دەست پێدەکەین، بەردەوام سور سور گەورەترین قوربانیمان رەنگی سورە پەیمانیش بدەیت بە خۆشەویستی تەمەن دەبێ بە خوێن سوێندی بۆ بخۆی گەر نا بڕوات پێ ناکات".

ووتی:

راستە.. وایە شێتەش هەر کە چاوی بە خوێنەکە کەوت تۆقی و ووتی:

"هاوارم کرد خودایە چیم کرد..؟ دەستم کردە گریان و بە پەلە رامکردە لای خولیاو ماچم کردو خوێنەکەیم سڕی.

بمبورە بەقوربان هیچ مەبەستێکم نەبوو بەخوا

بەڵام بێ چارە بوو هەر دەگریاو هاوار هاواری دەکرد دەنگی دەگەیشتە سەری کۆڵان، منیش دەمویست ژێری بکەمەوە بەر لەوەی باوکم بێتەوەو لێمبدا, بەڵام فریای ژێر بوونەوەی نەکەوتم و باوکم بەسەردا هاتەوە, بن باڵی دایکمی نابووە سەر شانی خۆی و سەبر سەبر هەنگاوی دەنا تا دایکم عەزیەت نەدا کە تازە لە نەشتەرگەری دەرچوو بوو بە توڕەییەوە هاواری کرد

"چی بووە..؟"

من رامکردە ژورەکەی سەرەوە کە کەنتۆرو قەرەوێڵەیەکی لێ بوو, بەلچێکە شۆڕو بەچاوی مۆنەوەو دڵیشم لەترسانا خەریك بوو لە جەستەم دەهاتە دەرەوە, لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتم, خولیا شکاتی لێکردم, باوکیشم دایکمی لەسەر جێگای خۆی داناو وەك گەردەلولێ هەڵیکردبێ بۆم هات, لەسەر قەرەوێڵەکە پرچی گرتم و تا

دەرەوە رایكێشام, جا تا توانی بە شەق‌و شەپازلەو سمی پێڵاوەكەی هەموو جەستەی شین‌و مۆر كردمەوە.
دڵۆپە فرمێسكەكانم بوون بە فرمێسكی مۆم تا دەهاتن گەورەتر دەبوون‌و دەیتواندمەوە باوكم هاواری لێ كردم
"مینگە مینگ كچێ هەڵسم هێندەی دی ئەتۆپێنم"
دایكیشم كە تاقەتی قسەكردنی نەمابوو نوزەیەكی لێوە هات‌و ووتی:
"بە تەمای تۆ ماڵ بە جێ دەهێڵم تۆش ئاوا دەكەی..؟"
چیم كردبوو.؟ ناچار خۆم بێ دەنگ كرد بەڵام گەرووم خەریك بوو دەتەقی هێندەی فرمێسكەكانم قووت بدەمەوە.
چاوەڕێم كرد تا باوكم لە ماڵێ چووە دەرێ, بەڵكو بیر لە خۆ كوشتن بكەمەوە، هەر چەندم كرد نەموێرا چەقۆ لە سنگم بچەقێنم یان لەسەر بان خۆم هەڵدەمە خوارێ، زەهری مشكم دیتەوە دڵنیا بووم لەوەی زەهر بونەوەر دەكوژێ بۆیە لە دۆلكەیەك ئاودا گرتمەوەو خواردمەوە، تام‌و بۆنێكی زۆر ناخۆشی لێدەهات، بەڵام بڕیارم دابوو تا زوترە دونیا بە جێ بهێڵم‌و ئارام بم لە گۆڕەكەمدا، جام لە جام دەمخواردەوەو نەیدەكوشتم بەڵام زۆر بێ تاقەتی كردم.

بانگم لە "شاریا"ی هاوڕێم كرد كە ماڵیان بە پشتمانەوە بوو, پێیم ووت كە زەهرێكی زۆرم خواردووەتەوەوەو ئێستا نا تۆزێكی تر دەمرم، قسەی پێ كردم ووتی رەنگت تێكچووە با بچین بۆ لای كاك كاربین.
كاربین برین پێچ بوو, ماڵیان دەكەوتە ئەودیوی گەڕەكی ئەوان, شێتە وەڵامی شاریا دابووەوە
"وازم لێبێنە نایەم با بمرم رزگارم بێ لەم جیهانە جەنجاڵەدا".
(شێتە) مردو گیانی بەخشی "شاریا"یش هاوار هاواری دەكردو دەگریا و رایدەتەكاند, فیزاح فیزاحی شاریا هەموو خەڵكی رژانە ماڵیان, دایكی لە شوێن خۆی لە هۆش چوو, ماڵەوە نەیاندەزانی دایكی بە ئاگا بێننەوە یان بە دیار شێتەوە شیوەن بكەن..!؟ گوێی لە ژنەكان بوو قسەیان دەكرد, یەكێكیان دەڵێ:
"هاوار بەماڵم چ جوانكیلەو ناسك نازداربوو، ئەوەی دی دەیووت: داخوا بۆ خۆی كوشت تۆ بڵێی كچێنی خۆی لە دەست نەدابێ‌و لە ترسان خۆی نەكوشتبێ؟ ئەوەی تریان دەیگێڕایەوە نەوەڵڵا دایكی كوێر بێ, هەموو رۆژێ ئەو بەستەزمانەی بەجێ دەهێشت‌و خوا دەیزانێ توشی چی

دەردێ هاتووەو مردووە، "شاریا"یش هاواری دەکردو پرچی خۆی دەڕنیەوە

کچێ هەستەوە مەمرە ئیدی لەگەڵ کێ قسە بکەم..؟

دوای شیوەنو باوکە ڕۆ (شێتە)یان کفنو دفن کردو جێیان هێشت ئیدی ئاگای لە دونیا نەما، چووە حزوری خودا وەلێ خودا رووی خۆی لێ وەرگێڕا شێتە پێی ووت:

"خودایە هاتمەوە لای خۆت، ئەرزی ئادەمو حەوام بەجێهێشت بۆ پێشوازی لە تیشكو عەبدی خۆت ناكەی..؟ بۆ قسەم لەگەڵ ناكەی..؟ من بۆیە هاتووم بۆ لای تۆ تا گللەیی لە جیهان بكەم تۆ راستیەكان دەزانی, پێیان بڵێو بچۆرە خەونیان كە من پاك بووم هیچ تاوانێكم نەبوو."

كەچی خودا نەك هەر قسەی لەگەڵدا نەكرد, بەڵكو ئاوڕیشی لێ نەداوە ڕێگایەكی پێ نیشاندا كە ئەوێندەر جێگەیەتی, لەوێندەریش ژنێكی زۆر بە پرچو بە مەمكو بە زمان هەڵواسربوون هەمووشیان یەك پارچە پشكۆو ئاگر بوون، لەو كاتەدا شێتە فەرموودەیەكی بیر كەوتەوە كە ئەو كەسەی خۆی بكوژێ لە قیامەتیش رۆژانە دەیسوتێنن و دەیكوژنەوە، كەواتە ئێستا بۆی دەركەوت كە بۆچ خودا قسەی لەگەڵدا نەدەكرد، كەوایە لەوێندەریش هەر تاوانبارە.

من گوێم لەم قسانە بوو لە ئاوێنەكە هاتمە دەرێو ووتم:

ئەوە دەڵێی چی..؟ مانای وایە شێتە مردووە..؟ دواتر لەكوێ بینیت چووە لای خوداو قسەی لەگەڵدا كرد..؟ بۆ بینینی خودا هێندە سانایە سەگە درۆزن..؟

ـ نانا كچێ شێتە چووە خەڵوەتی مەرگی خۆیەوە بە خەیاڵو ئەندێشە ئەم فێلمەی بینیبوو

تو سەیر زنوقم چوو، توخوا تۆش وەك من نەترسای..؟ (ئەو) زۆر شێتانە باسی شێتەمان بۆ دەكا.

شێتە:

" شاریا پەلی راكێشام ووتی بە دایكت دەڵێم، تكام لێ كرد كە كەس نەزانێ كارێكی وام كردووە دوایی هەر بە كێبڵو دار دەمكوژن، چووین بۆلای كاك كاربین, بەڵام لە ڕێگا تا گەیشتینە ئەوێ زۆر ڕشامەوە, ڕشانەوەیەكی پیس خەریك بوو گیانم دەربهێنێ"

. كاك كاربین زەهری خواردووە دەرزیەكی لێدە تا كاری لێ نەكردووەو نەیكوشتوە..!

. زەهری چی..؟

رووی كردە منو پێی ووتم:

زەهرت بۆ خواردووە..؟
منـیش هێنـدە رشـابومەوە تاقـەتی قسـە کـردنم نـەمابوو هیچم نەووت
شاریا وەڵامی دایەوە
ـ زەهـری مشـکی خـواردووە, لـە رێگـاش تـا گەیشـتوینەتە ئێرە زۆر رشایەوە
ـ باشـە مـادام هەڵیهێنـاوەتـەوە لێـی مەترسـە, بـەڵام بۆچـی وای کردووە..؟
شاریا ووتی لە داخی دایكو باوکی خۆی دەکوژێ.
کاربین بە دەم دەرزی لێدانەوە پێی ووتم:
"جا توخوا داناوەشێی..؟ پاشان قەیچێکە با دوو تفیشت لێبکەنو با لێت بدەنو قسەشت پێ بکەن دایكو باوکتن, گەر هیچت نەکردبێ لێت نادەنو قسەت پێ ناکەن دیارە شتێکت کردووە".
دوو دەرزی لەسەر یەك لێدامو هەندێ حەبی بۆ نووسیم، بە "شاریا"ی ووت کە ئێوارەش بمگەڕێنێتەوە بۆ لای, تا دوو دەرزی دیکـەم لێبـدا بـەڵکو باشـتربم، گەڕاینـەوە ماڵێ بەڵام لە ماڵەوە قەومابوو.
باوکم گەڕابووەوە ماڵێو چاوی گێڕابوو منـی نـەبینیبوو پرسیاری کردبووم کە لە کوێم, خوشکە بچوکەکەم کە لە
خولیا منالتر بوو بۆی گێڕابووەوە کە زەهـرم خـواردووەو لەگـەڵ شـاریا چـوومە بـۆ لای بـرین پـێچ، هێنـدەم نـەزانی بـاوکمو پورزاکـەم بـە ماشـێن هاتنـە سـەر رێمـان, رەنگـم زەرد هەڵگـەڕا کـە لـە ماشـێنەکە سـەر کـەوتین، بـاوکم نیوچەوانی گرژو مۆنو هەناسەیەکی توند لێی پرسیم:
ـ لە کوێ بووی..؟
ـ چووم بۆ لای کاك کاربین
ـ بۆ..؟
ـ سکم زۆر دەیەشاو زۆر رشامەوە
ـ بۆ رشایتەوە..؟
ـ نازانم
ئیدی باوکم هیچی دیکەی نەووت تا گەیشتینەوە ماڵێ، هەر کە گەیشتینەوە بەر دەرگای ماڵ بە لێدان تا ژورەوە بردمـی هـاوارم دەکـرد بـۆ لێمـدەدەی بـۆ ئـاخر چـیم کردووە..؟
ـ زەهر دەخۆی زەهـر دەخـۆی ئادەی ئـەو زەهـرەم بۆ بێنن با هەمووی بکەمە قوڕگیو بیکوژم.
منـیش جگـە لـە گریـان دەسـەڵاتی هیچـی دیکـەم نـەبوو, پورەکەم لەگەڵ کوڕە پورەکەم دەستی باوکمیان گرت تا ئیـدی لـێم نـەدا, بـە پەلـە پـەرداخێ شـیری گـەرمیان بـۆ

کردم‌و خواردمەوە, ئیدی چوومە ژورەکەی دی, پشتم دابووە دیوارەکەو دانیشتبووم هەر خۆم دەخواردەوە, خولیا بەزەیی پێمدا هاتەوەو بۆم گریا , هاتە لام ماچی کردم, منیش هەموو شتێکم لە بیری خۆم بردەوەو ماچم کرد ئیدی لەو رۆژەوە هەردووکمان بووین بە هاوڕێ.

ووتم: وەڵڵا حەق نەبوو لەگەڵیدا ئاشت بێتەوە.. ووتی: "ئاخر ئازیزم تۆ شێتەت نەدەناسی چۆن دڵێکی هەبوو، سەنگەساریشت بکردایە سەری هەڵنەدەبڕی بڵێ بۆ وا دەکەی، دڵی زۆر ناسك بوو زوو زووش توڕە دەبوو, بەڵام چەند زویر بوایە لێت هەر لەگەڵ بانگت بکردایە هەموو شتێکی بیر دەچووەوە".

## بەشی دووهەم

(شێتە) کاتێ کە لە پەیژەکان سەرکەوت‌و گەیشتە بەر دەم دەرگەی ژورەکەی خولیا شتێکی بە دەستی خولیاوە بینی ئا شتێك بوو رۆژنامەکە..!

ئەو رۆژنامەیەی دوێنێکەی لە کاتژمێر دەی بەیانیەوە تا سێ ی شەو تەماشای کردو خوێندیەوە, چی بەسەر هات..؟ نامۆی بیر کەوتەوە! لەدەستی وەرگرت‌و دووبارە نامەکەی خوێندەوە.

من دەمەوێ ئەو کچە بناسم بە دەنگێکی کزو لەسەرخۆ وایوت.. خولیا پرسی کێ..؟

. نامۆ

. نامۆ کێیە..؟

. ئەو کچەی ئەو نامەی نوسیوە

. هەها ها ها.. من دەیناسم

ـ بەچی پێدەکەنی..؟ چۆن دەیناسی ئەدی بۆ پێم ناڵێی..؟ خێرا پێم بڵێ کێیە..؟

ـ دە راوەستە راوە چی بووە قابیلە, خۆ دونیا بەسەر یەکدا نەڕوخا , کەی پێت وتوم کێیە تا پێتی بناسێنم..؟

. ئاخر تۆ نازانی چەند بە حەسرەت ناسینی نامۆم خولیا گیان..؟!

. منیش نەمبینیوە بەڵام ئاشنای ژیانیم

. چۆن..؟

ئێستا وەختی نیە بەخوا خەریکە لە برسا دەبوریمەوە با بچینەوە ماڵێ.

ئیدی ئەو پەلەی ماڵیی بوو, بارەگایان بە جێهێشتو لە شەقام پەڕینەوە ئەوبەری شەقام، هۆرنی ماشێنو تەعنەی پیاوە چاو برسیەکان بێزاریان کردن، لەوێندەریش هەر بە پەلە ماشێنێکیان راگرتو ناونیشانی گەڕەکی خۆیان داو سەرکەوتن، لێخوڕەکە لە ئاوێنەکەی پێش خۆی تەماشای دەکردن, لەو ساتەدا (شێتە) لێخوڕە تایبەتەکەی خۆیانی بیر کەوتەوە کە ئەویش کچێکی هەڵگرتووە لە ئاوێنەکەدا هێندە تەماشای کردبوو کچەکە لە خەفەتا رایگرتبوو پێی ووتبوو:

ـ کاکە گیان ئادەی ئاوڕێکم لێبدەوە

ـ بەڵێ فەرموو

ـ دەی تێر تەماشام بکە تا چاوەکانت تێر دەبن، پاشان ماشێنەکەت لێخوڕە وەرمان مەگەڕێنە تکایە.

شۆفێرەکەش ببوو بە قەترەیەك شەرمو تەریقوبونەوەو تکابووە سەر سوکانەکەی.

بزەیەکی هاتێ, خولیا لێی پرسی چیت بیرکەوتەوە وا پێدەکەنی..؟

شێتە بۆی گێڕایەوە کە چی بیرکەوتووەتەوە, خولیاش لەگەڵ ئەودا دایە قاقای پێکەنین لێخوڕەکەش کە گوێچکەکانی قیت کردبووەوەو گوێی لێ گرتبوون, لەگەڵ ئەواندا ئەویش پێکەنیو ئیدی لە ئاوێنەکە تەماشای نەکردن تا گەیشتینەوە ماڵێ.

دەی پێم بڵێ نامۆ کێیە..؟

شێتە ووتی:

"خولیا بە قسەکانی دیار بوو گاڵتەی پێ دەکردمو.. هەستی بەوە کرد نەخۆشم, بۆیە فشەی بە قسەکانمدا دەهات, کە بۆی دەرکەوت من بەراستمەو دەمەوێ نامۆ بناسم هیچ قسەیەکی بۆ نەکردمو.. پێی ووتم:

توخودا منیش شێت مەکە وەکو خۆت, لە خۆت بپرسە نامۆ کێیە خۆ لە من باشتر دەیناسی.

کوا دەیناسم..؟ جا بۆ من شێت بووم..؟ ئەو ناوەم لەخۆڕا پێوە نەلکابوو، بەڵێ خولیا تەنها کەسێك نەبوو کە پێم بڵێ شێتە, دایکمو هاوڕێکانیشم وایان پێ دەووتم چونکە زوو زوو تورە دەبوومو دەگریام کەوایە من شێتم شێت, ئیدی کەس گلەیی نەمێنێ لەسەرم, بریا تۆم دەدۆزیەوە نامۆ گیان تا باسی خۆم بۆ دەکردی هاوڕێ نەناسەکەم نامۆ.."."

لێیم پرسی باشە نامۆ کێ بوو وا شێتە هێندە حەزی دەکرد بیناسێ..؟

ووتی: ئەو کچەی کوڕێکی خۆشدەویست ناوی (کامۆ) بوو گەنجێکی جوان بوو، ڕۆژنامەنووسیش بوو, تەنها کەسێکیش بوو لە دڵی نامۆدا جێگیر بوو، نامۆ زۆری خۆشدەویست, ڕۆژانە نامەی بۆ دەنوسی, بەڵام پێدەچوو کامۆ نامەکانی فڕێداتە تەنەکەی خۆڵەوە, چونکە وەڵامی هیچ لەو نامانەی نەدایەوە، یەکەم جار بوو بیبینیّ، لەو وابوو دەمێکە ئەو ڕۆحە سەرسوڕماوە دەناسیّ، بۆیە هەموو ڕۆژێك یەك دووجار سەردانی دەکردو گفتی لەتەکدا دەگۆڕیەوە، تا زیاتر سەیری بکاتو جورئەت بکات پێی بڵیّ "خۆشمدەوێی"، زۆر جار لە سەردانەکانیدا بۆ لای کامۆ باوەشێك وشەی جوانی کۆ دەکردەوە، تا کاتیّ دەگاتە لای بۆی هەڵڕێژیّ، بەڵام لە هەموو جارەکاندا بە باوەشێك خەم دەگەڕایەوە ژورەکەی خۆی، چونکە کامۆ لە هیچ لە جارەکاندا ڕازی دڵی خۆی نەدەدرکاندو هیچ ئومێدێکی پیّ نەدەبەخشی، نامۆ تەسلیم ئەو قەدەرە نەدەبوو، قەدەرێك لە سیناریۆیەیەکی دۆڕاو دەچوو, کە بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵێك نوسرابیّو بیّ هەڵسەنگاندن لە هیچ شوێنێك وەرنەگیریّ، وێنەی یەکەمو دووەمو سێهەمو دەیەمی سیناریۆکە هەر دوو کەس بوون، پاڵەوان نەدەناسرا، یەکێکیان لە قوڵایی ڕابردووی خۆی چەقیوەو ئایندەی لیّ دیار نیە، ئەوەی دیکەیان دوای کڵاوی با بردوو کەوتووەو نایگرێتەوە، نامۆ بەردەوام دەسوتاو ئۆقرەی نەدەگرت ساتێك بیّ دانیشتن لەتەك ئەودا بمێنێتەوە، هەر لەسەر ئەو بەزمەش توشی لێپرسینەوەو ڕەخنە هات لە لایەن بەرپرسی دەزگاکەیان کە دەزگایەکی ڕوناکبیریی بوو بەڵام لە تاریکبیریی زیاتر هیچ ڕوناکییەکی تەنانەت بەقەدەر چرایەکیشی تیا بەدی نەدەکرا، خەیاڵی ئەوەی دەکرد کە چەند جارێك کامۆ نامەی بۆ نوسیوەو ئەم دەیەویّ وەڵامی بداتەوە، چونکە تا دەچووەوە ماڵ هەر لای کامۆو شەویش بە لای لایەکانی خەیاڵی, کە بە دەنگی عیشق بۆی دەوترایەوە خەوی لێدەکەوتو تەنها جەستەی وەك لاشەیەکی ساردو سڕو مردوو لەسەر پێخەفەکەی بەجێدەما، ئەگەر نا ڕۆحی بەدەوری کامۆدا سەمای بالێی دەکرد، ڕۆژێکیان بۆ چەند ساتێك ژورەکەی کامۆی بەجێهێشتو چووە لای بەرپرسی دەزگاکەیان کە کاری گرنگی پیّ بوو، بەڵام بەر لەوەی بڕوات نامەیەکی بۆ نوسیو لەسەر مێزەکەی بەجێی هێشت:

"خۆشەویستەکەم..

لێم ببورە گەر بەتەنیا بەجێم هێشتی، بەڵام ئازیزم بێ گومانبە زوو دێمەوە، تاوەکو زوتر بتبینم، ئەمڕۆش وەك ڕۆژانی تر بەچاو لەگەڵت بدوێم‌و بە ڕۆح باوەشت لێبدەم. بەڵام گیانە بەر لەوەی بێمەوە حەز دەکەم بڕیاری ئەوە بدەی کە چیدی بیر لە رابردووت نەکەیتەوەو پشت بە بەڵگەی عەقڵانی ببەستی، ژیانت خۆشبوێ‌و ئایندەت بەلاوە گرنگ بێ، تێگەیشتن لە ئێستا یەکێك بێ لە پرۆژەکانت..

ئازیز ئێمە دەڕۆین‌و ناگەڕێینەوە، ئەمڕۆ ڕۆژێکی دیکەیەو سبەی دێتە پێش، کەوایە با من‌و تۆ خۆمان ئامادە بکەین بۆ سبەی نەك بیر لە دوێنێ بکەینەوە، رابردوو لەگەڵ زەمەنی خۆی ڕۆی، سبەینێش با خۆی قەرار بدات چی دەکات, ئێمە لە ئەمڕۆدا دەژین, با بزانین ئەمڕۆ چی دەکەین ئەوە گرنگە.

ئازیز گیان.. رەنگە زۆر جاریش لێت حاڵیبی بوبم بەڵام نەمویستووە بزانی، چونکە خۆشمدەوێی، ئەو بڕیارانەی تۆ دەتدان لەگەڵ بیرکردنەوەکانی من نەدەگونجا، من تۆم دەوێ تا دوا هەناسەم، مەحاڵە بیر لە دوریت بکەمەوە چونکە ناتوانم لە دووریت بژیم.

خۆشەویستەکەم.. دەبێ بزانی تا خۆت هەبیت، تا چاوو دڵ‌و دەست‌و گیان‌و بیرکردنەوەت هەبێ هیچ شتێك مەحاڵ نیە، دەتوانی هەموو شتێك بە حەزی دڵی خۆت بێنیتە دی، تەمەنی ژیانیش کورتە جا با من‌و تۆ بە خۆشی بیبەینە سەر.

بەقوربان.. سوێند بەو عیشقە پاکەی لە دڵمدا هەیە بەرامبەر بەتۆ ، رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر بۆت دەسوتێم تۆ نایبینی، زیاتر دەگریم‌و دەناڵم هەستی پێ ناکەی، بۆیە دڵنیام کە بەراستی خۆشمدەوێی، ئارەزووی شوێنێکمە تەنها من‌و تۆی لێبین، تا بە بێ ترس‌و بێ شەرم ئەوەی لە دڵماندا هەیە بۆ یەکتری بڵێین.

لەگەڵ رێزو سلاوم بۆت دڵە گیان، گیانی من

شێتی تۆ

نامۆ"

کامۆ رۆژانە رۆژنامەکانی ناو شارو دەرەوەی شاری دەخوێندەوە بۆیە نامۆ بڕیاریدا ئەو نامانەی بۆ (کامۆ) دەیانوسی لە رۆژنامەیەکدا بڵاویان بکاتەوە، بەڵکو کامۆ بیانخوێنێتەوەو هەست بەنامۆ بکات‌و بزانێ چەندی خۆشدەوێ, کەچی (کامۆ) تەنها رۆژنامەیەك کە

نایدەخوێندەوە ئەو ڕۆژنامەیە بوو کە نامەکانی نامۆی لێ بڵاو دەکرایەوە, دواتریش (نامۆ) ئەو کەسەیە کە جیهانی جیهانێکە لە پاشماوەو پارچەکانی واقعی دەرەوە دروست بووە, نامەکانی نامۆ تەنها نامە نەبوون، بەڵکو لەپشت ئەو ووشانەوە وشەی دیکەی حەشار دابوو، نامەکانی تەماشای واقیعیان دەکردو لە واقیعیان دەکۆڵیەوە.. دزێوی‌و گەندەڵی ئەو واقیعەیان دەخستە ڕوو، نامۆ دیاردە زەقە شاراوەکانی دەخستە ژێر تیشك، مەبەستی نوسینەوەی واقیعیش نەبوو، بەڵکو دەیەوێت واقیع تێپەڕێنێ، نامۆ حەزی بە نوێبوونەوە بوو لەکۆن یاخیی دەبوو، جوانی دەپەرستو ناشرینی نەدەگرتە خۆ، دەیەویست سەربەستو ئازاد بێتو گشت کۆتو زنجیرەکان ببچڕێنێ، جەنگی لەگەڵ بووندا دەکرد لە ئاستی هیچ کۆسپو مەترسیەکدا سڵی نەدەکردەوە، هەر بۆیە لە خەیاڵنامەیەکیشدا بە شێتەی ڕاگەیاندبوو :

" شێتە گیان..

دەتەوێ بزانی من کێم..؟ لە ڕێگای نامەیەکەوە هێندە تامەزرۆی ناسینمی، ئەدی باسی چی خۆتم بۆ دەکەی..؟ تا لە ژێر سێبەری وڵاتێکی ئاوها بین هەموومان لەیەك دەچین.

باشە تۆ دەڵێی من شێتم، کە وابێ شێتێکی عاقڵی.. ئەدی من چۆن باسی خۆمت بۆ بکەم..؟ چۆن خۆمت بۆ بگێڕمەوە.. لە سیفری کام مێژووی کارەساتەکاندا بە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەست پێ بکەم..؟ نە ڕۆژێکەو نە دوو ڕۆژ, نە ساڵێکەو نە دوو ساڵ تەمەن بوو بە بیستو پێنج ساڵ من دەناڵم بە دەستی ڕۆژگارەوە، بەردەوام لە پەنجەرەیەکی تاریکەوە دەڕوانمە ئەو دیوی خۆم، نا پەنجەرەکی لێڵ وەك لێڵی دەروونم، پەنجەرەیەکی زەرد وەك ڕەنگی ڕوخسارم، پەنجەرەیەکی دەخراو وەك داخستنی هەموو دەرگاکانی ئاسودەیی بە ڕوومدا، پەنجەرەیەك لە من دەچێ لە نامۆیی ڕۆحم دەچێ بەم جیهانەدا, کامۆش دەڵێ: "من نامۆم بە ئاوو هەوای ئەم نیشتمانە، نامۆم بە هەموو کەسی ئەم نیشتمانە، هیچ شتێکم ناوێ لێرەدا مەمکە بە خەڵکی ئەم وڵاتە، من دەبێ شوێن پێیەکانم .. هەنگاوەکانم قەرز بکەم بۆ ڕۆیشتن لەسەر بستێ ڕێی ئەم خاکە"

منیش وەك کامۆ هەموو شتەکانم لێوە دیارن, هەموو مرۆڤەکانیش دەبینم چۆن گەمەی چاوشارکێ لەگەڵ ڕۆحی خۆیاندا دەکەن، کەچی نە شتەکان ئاوڕم لێدەدەنەوەو نە مرۆڤەکانیش بە چاوی مرۆڤەوە لێم

دەڕوانن، کەس نایەوێ لە نامۆییم حاڵیی بێ بە تۆشەوە هۆ کچە شەیداکەی بە ناسینم شێتە گیان، تەنها لە ڕۆخسارو جل‌و بەرگم دەڕوانن, تەماشای بالام دەکەن چاوم، پرچم، سینگم، سمتم، ڕۆیشتنم.

ئاااااا بمبەخشە بیرم چوو پێت بڵێم چۆن کچێکم, بالا ناوەندی قەڵەم ڕێك‌و ناوقەد باریك، ئێسکێکی وردم هەیە پێم دەڵێن زوو پیر نابی، بەڵێ وایە, هەرچەندە تەمەنم بۆ بیست‌و پێنج ساڵ دەچێ‌و دایکی کچێکی تەمەن حەوت ساڵانم، کەچی لە هەژدە ساڵان دەچم, دەست‌و قاچم بچکۆلەن، پەنجەکانم مۆزیکین, دەنگێکی بە سۆزم هەیە, پرچێکی ڕەشی لوول‌و ڕەنگی چاوم هەنگوینیە، زۆر جوانم، خۆم واناڵێم ئاوێنەکەشم وا ناڵێت, ئەوە ئەوانن وام پێدەڵێن ڕەنگە گەر تۆش بمبینی هەروام پێ بڵێی شێتە گیان،  ژیان لەم وڵاتەدا زەحمەتە, ئێمە لە شوێنێك دەژین پێی دەڵێن وڵاتی قەزاو قەدەر، تۆ هەوڵدە خۆتت خۆشبوێ‌و گاڵتە بە هەڵوەرینی گەڵاکانی تەمەن بکە، فەلسەفەی تایبەتی خۆت هەبێ، بڕوات بە مەحاڵ نەبێ، چونکە هەوڵدان هیچ شتێك مەحاڵ ناکات، هیچ قفڵێك بێ کلیل دروست نەبووە، دڵنیابە دەرگا داخرا کرانەوەی دەبێ، گەر هەر بۆت نەکرایەوە بیشکێنە، هەر چەندە من لە تۆ کلۆڵترم, بەڵام گەر من وام بۆ نەکرێ دەمەوێ بەم نامەیەم تۆو هەموو ئەو کەسانەی دیکەی کە لە من دەچن بیانگەیەنمە ئەو شوێنەی خۆم دەستم نایانگاتێ, ئەو دادگایە بە کە بەرگری لەشتەجوانەکان دەکات‌و حوکم بەسەر شتە ناشرینەکان دەدا، خەیاڵت فراوان بێ.. بۆ مانەوەت لە ژیان هەموو کەلتورێکت قبوڵ بێ‌و هەموو نەتەوەو پێغەمبەرو مەسیح‌و یەهودو ئیسلامیشت خۆش بوێ‌و لە زەریای خۆتیان هەڵبکێشە, چونکە دواجار دەبێ بزانی هەموو ئەوانە یەك خودایەکیان هەیە، لە هەموو پانتایەکی جوگرافیدا هەوڵدە بڕیارە جوانەکانت فەرز بکەیت، هەوڵدە شتێك بگەیێنیێ‌و خەون بە شتێکی دیکەوە ببینی، پەیامێکت پێبێ بیگەیەنە بە هەموو جیهان بەر لەوەی بمری، پەردە هەڵدەوە لەسەر دەمامکەکانی ژیان، بگەڕێ بەدوی جوانی قێز بکەرەوە لە جەنگ، پرسیارێك بکە خەڵك بەدوی وەڵامیدا بگەڕێ، ئەوینێك پێبێ نیشانی دڵەکانی بدە، ڕاستیەك بڵێ‌و گوریسی هەموو درۆزنەکان هەڵوەشێنەوە، کانیاوی قسەی نەستەقت لەلابێ تا تینوێتی ڕێبوارانی پێ بشکێنی، خۆت لە درۆو خوێن‌و رق‌و ریایی بەدور بگرە، تا جوانی‌و پیرۆزی خۆت بپارێزی.

شێتە گیان.. ژیان زۆر لەوە سەخیفترە دەرەقەتی نەیەی، هەوڵبدە بەردەوام براوە بیت, دەبێ بە جورئەتەوە بەرەنگاری هەموو دەردو مەینەتیەکان ببیتەوە بۆ بەدەستهێنانی ئامانج و بەدیهێنانی خەونەکانت، من دۆڕام مەدالیای سەرکەوتنم دایە دەستی ئەو کوڕەی کە نازانێ ئایەتەکانی ئەوینم تەفسیر بکات  ئەو کوڕەی رۆژی هەزار جار خۆم دەکەمە قوربانی کەچی بیرم چوو لەم ولاتەدا قوربانیدان گەمژەییە، عیشق شورەییە، خۆشەویستی بەرژەوەندیە، هەرچەندە ئەم ئاکارانە لای کامۆ نیە، بەڵام بەمن چی !! کە (ئەو) عەوداڵی سەرابێکە لە مندا وون دەبێ، شێتی رۆحێکە لە جەستەی مندا دەمرێ، رۆخسارێك دەبینێ لە رەنگی من ناچێ.. ملی رێگایەك دەگرێ نایەتەوە سەرماڵی من، سەرەرای ئەوەش هەر ئازیزەو هەر ئەو رۆحەیە کە رۆحی من پێی ئاشناو ئاسودەیە.

شێتە گیان.. بمخوێنەوە خۆت لە مندا دەبینیەوە.

رۆحی تۆ

نامۆ"

## بەشی سێهەم

شێتە لە خولیای پرسی مێژووی دەرچوونی ئەم رۆژنامەیە کەیە..؟

ووتی: دوو هەفتە جارێك دەردەچێت.

ـ ئۆۆۆی ئەو ماوەیە گەلێك زۆرە بۆ من، لە چاوەڕوانی ژمارەیەکی دیکەی رۆژنامەکە رۆژێکم لێ دەبێ بە دە رۆژ، خۆ من هەموو تەمەنم لە چاوەڕوانیدا تەواو کرد, بیرم دێ لەوەتەی هەم من سەرەڕۆو کەساسم خۆشیم نەدیوە نە لە خۆم لە خەڵکی سەر ئەم زەمینە، جا کە قسەش دەکەم پێم دەڵێن بۆ هێندە رەشبینی؟ چۆن رەشبین نەبم

خودایــە..؟ حــەق دەدەم بــە خــەڵکی چ دەڵــێنو نــاڵێن قسەیەکی خۆمان هەیە دەڵێ: "ئەوەی نیە لە ماڵم ئاگای نیە لە حاڵم" هەر کەسێکیش لێم بپرسێ بۆ بێ دەنگی بۆ رەنگت زەرد هەڵگەڕاوە؟ گەرووم پڕ دەبێ لە گریەو قسەم بۆ نایەت، هێندەم دەردە سەری و خەم بینیوە ناتوانم هیچیان بگێڕمەوە، لەوە دەترسم بە گەمژە لە قەڵەمم بدەنو پێم پێ بکەنن, یان بەزەییان پێمدا بێتەوەو گەورەییم نەمێنێ لە لایان، وەك سواڵکەری سۆز لێم بڕوانن و سۆزم نەدەنێ، ئاخر من نامەوێ گاڵتەم پێ بکەنن و نە دەخوازم بەزەییان پێم بێتەوە نا نا.. هیچم ناوێ لەوان جگە لە رێز گرتن، ئەوان رێز لەو دڵۆپە فرمێسکانەشم ناگرن کە لەمنداڵدانی چاوم لە دایك دەبن، هەر کە گریانیان بە چاوەکانمەوە بینی بە زەعیفترین زەعیفە بانگم دەکەن، ئاخر خۆ رژانی ئەشك هەستی مرۆڤایەتی دەردەبڕێ, بۆ بە بێ دەسەڵاتی دەزانن..؟ ئیدی هەڵێکیان بۆ دەرەخسێ بۆ لەناو دانم، بۆ کوشتنی هەستە ناسکەکانم، وام لێ دەکەن رقم لە هەموو کەسێك ببێتەوە تەنانەت خۆیشم، من دەزانم لەمنداڵدانی خەم بۆ خەم لەدایك بوومەو تەنها لەگەڵ خەمیش دەتوانم هەڵکەم.
خولیا بە دەمو چاوێکی پەشۆکاوەوە:

"دە بەسە واز لە پرتەو بۆڵە بێنە ئیدی ئەوە قەدەری تۆ بووە هێندەی مەڵێرەوە".

دوو هەفتەکە تێپەڕی و شێتە رۆژنامەکەی نەدی, کە پرسیاری کردەوە, وتیان راستە لەسەری نوسراوە دوو هەفتە جارێك دەردەچێت بەڵام دوای مانگێك زۆر جار مانگێکیش تێپەڕ دەکات پاشان دەردەچێت، بیری لە نوسینەوەی نامەیەك کردەوە بینێرێ بەر لە دەرچوونی ژمارەکە، بەڵام دوو دڵ بوو لەوەی کە چۆن بینێرێ چۆن بە ناوی خۆی دایگرێ..؟ خۆ گەر بیانزانیبا نامە دەنوسێ دەیانکرد بە هەڵڵا، مەگەر بە نازناوێك بینارداية! خەریك نوسینی نامەکە بوو خولیا تەلیفۆنی بۆ کرد.
. ئەلو ها چۆنی..؟
. سوپاس.. تۆ چۆنی..؟
. ئەمرۆ دێی بۆ لامان..؟
. نازانم جارێ ئیشم هەیە بۆ..؟
ــ هەروا.. ژمارەیەکی تازەی رۆژنامەکەمان بۆ هات ناتەوێ..؟
. کام رۆژنامە..؟
. ئەوەی لاپەڕەی (ستونی رازەکان)ی تێدایە

. توخوا بەراستە..؟ دە ژمارەیەکم بۆ لادەو مەیدە بەکەس
ئێستا دێم
. بۆ تۆ هاتووە
. باشە باش هاتم

دایخستەوە لە بیری چوو پێی بڵێ بزانێ ئەمجارەش نامەی نامۆی تێدایە..؟، بەڵی تیای بوو، نامۆ بەردەوام بوو لە نامە نوسین بەر لە بڵاوکردنەوەی ئەو نامانەش چەندین نامەی دیکەی نوسیوەو لەسەر مێزەکەی بۆی بەجێهێشتووە، پێدەچێ کۆپیەکی ئەو نامانەم لەلابێ دوای خوێندنەوەی ئەم نامەیە دەگەڕێم لە دوی ئەوانی دیکەو بۆتی دەخوێنمەوە, جا تێدەگەی خۆشەویستیو ئەوینی نامۆ چەند جوان بووە، نامەکەی ئەمجارەی کە لە رۆژنامەکەدا بڵاو بووەوە درێژتر بوو شێتە خوێندیەوە:

## "خۆشەویستم..

کات یەكو نیوی شەوە، خەڵك نوستوو لەنێو باخەڵی جێدا، دەروێشو مەلا خەریکی زیکرو تاعەتی خودان لەسەر بەرماڵی وجودا.. منیش سەرقاڵی داگرتنی ئەستێرەکانم تا لەم چەند لاپەڕەدا بیانبەخشم بە تۆ..

پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر پەیوەندی شێتانەمان.. جارێکی تر بەهەمان ریتمی مۆسیقای جاران پێت دەڵێم خۆشمدەوێی، چونکە لە کۆتایی رێگای هەموو پەیڤێكو دەرەنجامی هەموو بیرکردنەوەیەکم خۆم بۆ ئاشکرا دەبێ کە خۆشمدەوێی، مەشپرسە بۆو لەبەرچیو بەکەڵکی چی دێمو چ ئاسودەییەکم بەخشیوە پێت..؟ چونکە وەڵامی هیچ لەم پرسیارانەم پێ نیە جگە لەوەی دەتوانم پێت بڵێم ئەو ساتانەی هەست بە ئاسودەیی دەکەم.. ئەو ساتانەن کە دەتبینمو گوێم لەدەنگت دەبێ.. هەر کاتێکیش هەست بە بوونی خۆم کردبێ لەم جیهانە جەنجاڵەدا.. ئەو کاتانە بوونە کە لەگەڵ تۆو بەتەك تۆوە دانیشتووم، هەر ساتێکیش جوانی خۆم بینیبێ لە ئاوێنەی ژیاندا.. ئەو ساتانە بوونە کە شیعرێکت بۆ خوێندومەتەوە، یان چیرۆکێکت بۆ گێڕاومەتەوە.. جوانترین رۆژیشم ئەو رۆژانە بونە.. کە خەندەم لەسەر لێوی تۆ بینیوە.. جا منێك، منێکی عاشقی سەر شێت، منێکی گەمژە، منێك منداڵ خوێت وتەنی، منێکی نامۆ بە جیهان، کە لەتیشکی نیگاکانت غەرقی بێدەنگی دەبمو لە بزەی نیگاکانت خەندە بگرمو لەهەنگاوی رۆیشتنی نیگاکانت بگریمو لە حیکایەتی

نیگاکانت گوێ رادێرمو له ئاستی مەستی وتەو نیگاکانت سەرسام بم.. دەسەڵاتی چیم دەبێو چی بکەمو چی بڵێم جگە لە دەربڕینی دوو وشەو سوژدەی رۆحم لەبەردەم عەشقتدا ئەزیزی من..؟

تۆ ئەو شەپۆلەی لە دەریای مندا، بوی بە رۆحێ جوڵاندت جەستەم.. بەبێ تۆ وێڵم لە دونیای بێ خەم.. تەنها تۆم ئەوێ بەخوا بێ قەستەم.. کەوابێ بێ تۆ هیچم هیچ ئەزیزی من

خەڵکی بەسەرما هەڵدەدەن, من سەرم دادەنێم لەرێی تۆ, خەڵکی رۆحم پێدەبەخشم، من رۆحی خۆشم دەکەمە میوانی تۆ، خەڵکی خەندەم بەدیاری بۆ دەهێنن.. من هەمووی دەبەخشمە چاوو لێوەکانی تۆ، خەڵکی موجامەلەو ئاشتیم بۆ دەخوازن من دەیکەمە قوربانی تورەبوونو سەرگوزشتەکانی تۆ, چونکە دەزانم شەڕی تۆ لە ئاشتی خەڵك باشترە بۆمن ئەزیزی من, بیستو دوو ساڵ بەر لە ئێستا سۆزی منداڵی خۆم لە دەستدا, باوەشی تۆ پێی بەخشیمەوە، حەوت ساڵیش پێش ئێستا نەفرەتم لە بونی خۆم کردو دڵم مرد، تۆ فێری لێدانو ژیانەوەت کرد، پێش سێ ساڵو نیو باوکیشم مرد ماچێکی رۆحت بیری بردمەوە بەر لە دوو ساڵی خەفەکراویش رۆحم ون کرد لەلای تۆ دۆزیمەوە، جا کە تۆیەك بویتەتە باوكو براو مامو خاڵو هاوڕێو خۆشەویستم چۆن بتوانم کاڵ ببمەوە لەوەی کە ئێستا لەماڵی سۆز رەنگی ئاتەشیم گرتووە، چۆن رۆحبەرداری ئەو جیهانە جوانە بم کە بەتەك تۆوەیە..؟ چۆن نەگریێم لە بینینو بیستنی ئەو شتانەی نائومێدم دەکەن ئەزیزی من..؟

من هەرگیز بێئومێد نیم لەوەی تۆ منت خۆشناوێ.. نا وا نیە.. ئەگەر واش حاڵیبێتم هەڵە بومە، چونکە هەموو پەیڤەکانت، تێبینیەکانت، روانینەکانت, تەنانەت تورەبونەکانیشت دڵنیام دەکەنەوە کە تۆ منت خۆشدەوێ، ئەو شەوەشم بیرناچێ کە تلیفۆنت بۆ کردمو دوای بیروڕاو ورتە ورتی تریفەی ئەستێرەکانی رۆحمانو گێڕانەوەی حیکایەتی هەڵوەرینی تەڵە پرچەکانی شەو بۆ یەکەم جار گوێم لە دەنگت بوو، گەرویەك تاساوی گریانو بە رۆحێکی پڕ لە لەرزو هەناسەیەکی ماندوو چاو پڕ لە ئەشك.. پێت ووتم "خۆشمدەوێی". ئای خودایە چەند جوان بوون ئەو دوو وشەی لەسەر زاری دەرچوون، بە ریتمی مۆسیقایەکی نەرمو سەدایەکی گەورە تا ئەمڕۆش لە هزرو گوێچکەمدا دەزرینگێنەوە، دڵنیاش بووم کە

درۆم لەگەڵ ناكەی چونكە بەر لە دوو ساڵیش بەهەمان ریتمو هەناسەو فرمێسكەوە پێم ووتی: "خۆشمدەوێی" ئەزیزی من..

مەحبوبەت

نامۆ"

(شـێتە) ئـەو چـەند دێـڕەی كۆتـایی دوو سـێ جـار خوێنـدەوە, كـە نوسـیبووی"بیسـتو دوو سـاڵ بـەر لـە ئێستا سۆزی منداڵی خۆم لە دەستدا.. باوەشی تۆ پێی بەخشیمەوە، حەوت ساڵیش پێش ئێستا نەفرەتم لە بونی خۆم كردو دڵم مرد تۆ فێری لێدانو ژیانەوەت كرد، پێش سێ ساڵو نیو باوكیشم مرد ماچێكی رۆحت بیری بردمەوە بەر لە دوو ساڵی خەفەكراویش رۆحم ون كرد، لەلای تۆ دۆزیمەوە".

شێتە تەزی بە دیار نامەكەی ئەمجارەی نامۆ لەدڵی خۆی دەیووت:

"باشە نامۆ ئەم چەند ساڵانەی بۆوا بەسەر رەنگێكی شوما دابەشكردووە..؟ لەو ساڵانەدا چی بووە.. هاوار خودایە بۆ ئەم كچەم پێ ناناسێنی تا راستیەكان بناسم، بۆ هەموو شتەكان شاراوەن هەر وەك نامەكانی نامۆ دەمامكیان كردووە..؟" بەدەنگێكی لەرزۆك دەیووت: "سوپاسی كامۆ دەكەم كە ساڵەكانی پێ بەخشیوەتەوە".

شێتە هێندەی دی شێت بوو، ئاگر لە دڵی بەربوو, تەنها شتێك كە دەیتوانی ئەو ئاگرە بكوژێنێتەوە راستیەكانو كەسایەتی نامۆ بوو.

منیش بۆ ئەوەی لە مەسەلەكە تێبگەمو وەك شێتە شێت نەبم بە (ئەو)م ووت:

باشە نامۆ بۆچی لەم نامەیەدا ئەم ساڵانەی نەفرەت لێكراو بوونە..؟

ووتی:

نامۆ تەمەنی دووساڵو نیو دەبوو گەورەیان كرد، چونكە كچی گەورەی ماڵ بوو نوێ بەرەی دایەو بابە بوو، دایكی فێری كردبوو كە ئەو كچی گەورەی ماڵەو دەبێ یارمەتی بداتو ئیشی ماڵەوەی لەگەڵدا بكات، هەرچەندە دایكی مەبەستێكی نەبوو تا لەو تەمەنە بچوكەیدا یارمەتی بدات بەڵام ئیدی سروشتی نامۆ وابوو, كە گوێی لە قسەی گەورە دەگرتو لە هزریدا قەدی دەكرد، نامۆ لەو رۆژەوە خۆی بە كچی گەورەی ماڵ زانی, بەو تەمەنە بچكۆلەوە عەقڵێكی گەورەیان بۆ دروست كرد، خۆی لە منداڵەكانی

کـوڵاَن دور دەکـردەوەو گەمــەی نـەدەکردو دەیـووت مـن گەورە بوومە شورەییە گەمەی ماڵە باجێنە لەگەڵ کچانی کۆڵاندا بکەم، نـامۆ بـە منداڵی پرسیاری گـەورە گـەورەی لەلا دروسـت دەبوو، وەڵامیـان دەدایـەوە کـە خـودا هـەموو شـتێك دەزانـیٚ بۆیـە هـەر لـەو تەمەنـەدا بـە دووی خـودادا دەگـەڕا تـا وەڵامـی پرسـیارەکانی بداتـەوە، نـامۆ لـە نـاو هـەموو خەڵکدا بـە منـداڵێکی زۆر هۆشـیارو بـیٚ دەنـگ لـە قەڵـەم دەدرا، هــەموو خــەڵك خۆشـیان دەویسـت، بــەڵام لەناخــەوە بـیٚ دەنـگ نـەبوو زۆر شـتی پـیٚ بـوو، ڕێگـای دەربڕینـــی نەدەدۆزیـــەوە، نـــامۆ جەســـتەیەکی بچـــوك‌و تەمـەنێکی بچوك‌و عـەقڵێکی گـەورەیان داپێـی، بۆیـە پێـی وابــوو ســۆزی منــداڵی لەدەســت داوەو دەبــیٚ دووبــارە بگەڕێتەوەو لە نێو باوەشی خۆشەویستەکەیدا هەست بەو سۆزە بکاتـەوە کـە لـە منداڵیـدا تێـر بـۆنی سـینگی دایـەو بابەی نەکردبوو، چونکە تەمەنی ساڵێك بوو مەخلوقێك لـە دامێنی دایکی بەربووە پێیان دەووت کوڕ، کەوابوو نـامۆ بـرای لیٚ پـەیابوو ئیـدی بـاوکی وەك جـاران گەمـەی لەگـەڵ نـامۆ نـەدەکردو نـە دایکیشـی لـە باوەشـی خـۆی دەنوانـد، هـەموو سـۆزو گەمـەو باوەشـەکانیان لـە نـامۆ سـەندەوەو دایان بەو مەخلوقەی تر چونکە کوڕ بوو، دەڵێن کاتیٚ ئـەو

برایەی لەدایك بووە مامانەکە پارەی زیاتری وەرگرتووەو بابــەو بــاپیرەش نێوچــەوانی دایکیــان مــاچ کــردووە کــە "ڕەزا"ی بۆیان هێناوە، دواتر ووتی:

"دەزانـی بـاپیرەی منـیش وابـوو بـە کـوڕی دەووت ڕەزا، ساڵانە دایکە داماوەکەم سکی پڕ دەکرد تا کوڕی ببیٚ کەچی هەر کچی دەبوو، باپیرەم تورە دەبوو دەیووت:

ئەو هەموو (........) بۆچیە؟ ڕەزامان دەویٚ ڕەزا

بەڵام خۆ خەتا لە دایکم نەبوو ڕەزای ببیٚ یان نا".

گەڕانمـەوە لای بابەتەکـەی خۆمـان پرسـیاری نـامۆم لێـی کردەوە، ووتم:

ئیٚ باسی نامۆم بۆ بکە با منیش وەك شێتە شێت نەبم، نامۆ باسی حەوت ساڵ دەکا چی بووە لەو ماوەیەدا..؟

ووتی:

"نـــامۆ تەمـــەنی 16ســـاڵان بـــوو بـــاوکی دای بەشـــوو پێشکەشـی کـرد بـە کـوڕی مـامی، هـەر چـەندە ئـەو کـوڕە مامـە هـیچ مانـاو بەهایـەکی نـەبوو لـە دڵـی نـامۆدا چـونکە هـەر بـە منـداڵیش ڕقـی لیٚ دەبووەوە, کەچـی کـە گـەورەش بوو دایان بەو، نامۆ لە بەهارێکدا جلی بوکیان کردە بـەری بـە بـیٚ ویسـتی خـۆی، بـەڵام چـی بکـا بڕیـاری بـاوکی بـوو دەبـیٚ هـەر شـوو بکـات بـەو ئامۆزایـە، لـە هەفتانەکەیـدا

ناكۆكی دروست بوو له نێوان نامۆو ئامۆزاكه‌ی.. چونكه نامۆ له‌و حه‌وت رۆژه‌دا بۆی ده‌ركه‌وت كه ژیان له‌گه‌ڵ ئه‌م كوڕه مامه‌یدا كه هاوسه‌ریه‌تی ئه‌سته‌مه، گه‌یشته ئه‌و بڕوایه‌ی ناتوانێ زیاتر له‌گه‌ڵ مرۆڤێكدا بژێت خۆشی نه‌وێت سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش خراپ‌و زمان پیس‌و نه‌خوێنه‌وارو درۆزن بێ، به‌ڵام كاتێ به باوكی راگه‌یاند كه هاوسه‌ره‌كه‌ی به‌كه‌ڵك نایات باوكی له‌ده‌می دایه‌وه‌و هه‌ڕه‌شه‌ی لێكرد كه ده‌بێ قبوڵی بكات چونكه خه‌ڵكی ئه‌وه ناڵێن‌و ده‌ڵێن: كچه دوێنێ شووی كرد بۆ گه‌ڕایه‌وه..؟! له‌وێنده‌ر هاوسه‌ره‌كه‌شی نه‌یده‌ویست نامۆ له ده‌ست بدات، كه‌واته نامۆ له نێوان بڕیاری پیاوو باوكیدا چه‌قی به‌ست‌و ناتوانێ بگه‌ڕێته‌وه وه‌ك جاری جارانی.. نامۆ شووی كردو ده‌بێ هه‌موو سته‌مێكی قبوڵ بێ، ژیانێكی زۆر سه‌ختی برده سه‌ر له‌گه‌ڵ ئه‌و پیاوه شه‌ڕ فرۆشه‌یدا كچێكیشی لێ هه‌یه.

ووتم: راست ده‌كه‌ی له خه‌یاڵنامه‌كه‌یشدا كه بۆ شێته‌ی نوسیبوو ده‌ڵێ دایكی كچێكی ته‌مه‌ن حه‌وت ساڵانم به‌ڵام چۆن..؟ كه‌واته تا ئێستاش ماوه‌ته‌وه له‌گه‌ڵ ئامۆزاكه‌ی..؟

ـ نه‌بابه نا!

ـ ئه‌ی..؟

ـ سێ مانگ له‌گه‌ڵی دانیشت

ـ ئه‌ی تۆ ناڵێی نه پیاوه‌كه‌ی ئیزنی ده‌داو نه باوكیشی قبوڵی ده‌كرده‌وه..؟

ـ با.. به‌ڵام نامۆ سیاسه‌تێكی به‌كارهێنا بۆ كڕینه‌وه‌ی خۆی‌و دووباره ژیانه‌وه

ـ چۆن پێم بڵێ حه‌ز ده‌كه‌م بزانم به‌ڵكو ئێمه‌ش شتێكی لێ فێر بین..؟

ـ به‌خوا تاقه‌تی گێڕانه‌وه‌م نیه مه‌سه‌له‌یه‌كی زۆر دوورو درێژه وا به ئاسانی ته‌واو نابێ

ـ ده به‌خوا ترشت بێ یان تاڵ ده‌بێ بۆمی بگێڕیته‌وه

ووتی:

نامۆ كاتێ خوێندنه‌وه‌ی بۆ هه‌ردوولا كردو.. خوێندنه‌وه‌ی بۆ ویست‌و ده‌روونی خۆیشی كرد، به باشی زانی درۆ له‌گه‌ڵ ئه‌واندا بكات‌و خۆی رازی بكات, چونكه كه‌سێك بوو بۆ خۆی ده‌ژیا نه‌یده‌ویست كه‌سێكی تر قه‌راری له‌سه‌ر بدا.

ـ ئێ.. چۆن درۆیه‌ك..؟

ـ یه‌كه‌م جار خۆی نه‌خۆش كرد كه گوایه له‌گۆ چووه‌و له‌قاچ كه‌وتووه‌و ناتوانێ رێبكا، ئامۆژنی‌و ماڵه‌وه‌ی زۆر به‌ده‌وریدا ده‌هاتن‌و ده‌چوون چاره‌ی نه‌بوو سه‌یدو شێخ‌و

مەلای شاریان هێنا هەر چاك نەبوو.. بەكۆڵ بردیان بۆ نەخۆشخانە لەوێندەر نامۆ پزیشكەكەی تێگەیاند كە ئەوان بچنە دەرێ‌و هەندێ قسەی لەگەڵدا بكاتو پێی ووت:

. دكتۆر گیان بمبورە

. بەڵێ كەرەمكە

ـ من نەخۆش نیم بەڵام نامەوێ لەگەڵ ئەمانەدا بژیم، دەمەوێ بگەڕێمەوە ماڵی بابم

. بۆ.. خراپن لەگەڵتدا..؟

. نەخێر خۆم خراپم

. تێناگەم

. حەقت نەبێ دكتۆر گیان بەس هەندێ دەرزی‌و دەرمانم بۆ بنوسە با نەزانن بە درۆ وام لەخۆم كردووە بەڵام پێیان بڵێ بمبەنەوە ماڵی بابم بەو مەبەستەی پێویستم بە پشووە

. باشە بەسەر چاو

ئیدی دكتۆرەكە ئامۆژنی نامۆی بانگكردەوە ژوورێ‌و لەبەرچاویاندا هەندێ چەكوشی كێشا بەسەر ئەژنۆیداو قاچەكانی چەند جارێك هێناو برد دواتر پێی ووت:

هەستە ئێستا چاكبوویتەوەو نەخۆشیت نەما.. رووی كردە ماڵی ئامۆژنیشی ووتی:

ـ ئەم ئافرەتە نەخۆشە دەبێ بیبەنەوە ماڵی باوكی تا هەندێ ئیسراحەت دەكا

. وەڵڵا جا خۆ كوڕەكەم لە ماڵ نیە دەبێ چاوەڕێی ئەو بكەین خۆی بیباتەوە، بەڵام دكتۆر گیان ماڵی پیاوی باشترە وەك لەماڵ باوكی وابزانم لێرە باشتر ئیسراحەت دەكا وانیە..؟

. نەخێر وانیە.. رەنگە زیاتر دڵی بە دایكو براو خوشكو باوكی بكرێتەوە

ـ باشە با پیاوی خۆی بیباتەوە من حەقم نیە بەخوا كوڕەكەم خۆی شێتە جا بزانێ بێ پرسی ئەویش ئەمم بردۆتەوە ئەوەندی دی تێك دەچێ

. باشە باش خۆ من ناڵێم بێ پرسی ئەو بیبەنەوە بەڵام گەر دەتانەوێ چاك بێتەوە با لەماڵی بابی چاك بێتەوە

. زۆر مەمنونتین دكتۆر گیان تۆشمان ماندوو كرد

. ئەركی سەر شانمانە

. خواحافیز

. خواحافیزتان بێ"

نامۆیان بردەوە ماڵیٌو نەیان بردەوە ماڵی بابی، چەند ڕۆژێك دوای ئەوە نامۆ براکەی هات بۆ سەردانی، نامۆ نامەیەکی بۆ باوکی نوسیو خستیە قەدی جلەکانی براکەیەوە تا کاتیٌ کە چووە بۆ ماڵ جا بزانیٌ کە نامەی بۆ باوکی نوسیوە، براکەی گەیشتەوە ماڵیٌو جلەکانی خستەوە نێو دۆڵابەکەی خۆیو کاغەزێك بەرەوەبوو لەسەری نوسرابوو بگات بە دەستی باوکم، "کارۆ"ی براشی بیٌ ئەوەی نامەکە بکاتەوە بزانیٌ چی تیا نوسراوە دایە دەست باوکی ووتی:

"نامۆ نامەی بۆ ناردووی"

کاتیٌ باوکی نامەکەی کردەوەو خوێندیەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو نامەکەی هەڵدایە نێو دۆڵابەکەی خۆیو کلۆمیدا دواتر چووە دەرەوەو لەبەر دەرگاکە دانیشت.

پێیم ووت: چی لە نامەکە نوسرابوو..؟ ووتی:

ئەمە تەنها پرسیاری تۆ نەبوو دایكو خوشكو براکانیشی هەمان پرسیاریان کرد, کاتیٌ باوکی بە بیٌ دەنگی نامەکەی خوێندەوەو بەکەسی نەوت چی تیا نوسراوە، چونکە پێویستی نەدەکرد کەس بزانیٌ چی تیا نوسرابوو, نامەکە تەنها بۆ باوکی نوسیبوو دوای ئەوەی باوکی مرد پاشان نامەکە نامۆ خۆی دەری کردو خوێندیەوەو سوتاندی

. توخودا چی نوسیبوو..؟

. نووسیبووی:

"بابە گیان..

چاوەکانت ماچ دەکەم, بابە زۆرت بیردەکەم ,زۆر حەز دەکەم بێمەوە خزمەتت, ئاواتەخوازم بگەڕێمەوە تا ئەو کاتانەی دێیتەوە بەخێرهاتنەوەت بکەمو ئاوت بدەمە دەستو هیلاکیت بڕەوێنمەوە بەڵام ئەفسوس کچەکەت مرد, بەدەستی خۆت کوشتتو چاڵێکت بۆ هەڵکەندو زینەبەچاڵت کرد، ئاخر بابە تاوانێکی نەبوو نامۆ, بۆچی بێزار بووی لێی..؟ لە پێناو ئەوەی پێت بڵێن پیاوێکی چەند باشو بەرەحمە؟ کچەکەی خۆی بەکراسی بەری دا بە برازاکەی..؟ بابە گیان تازە کۆتایی بە ژیانی من هات هەر لەو ساتەی خۆم کردە قوربانی بڕیارەکانت، گەر دەزانی چەند نەخۆشم چەند غەمبارم جگە لە گریەو دوو دوعا لەسەر بەرماڵەکەم کە ئەوانیش ناگەنە حزوری خودا هیچی دیکە ناکەم بابە..

بابە گیان.. هەست دەکەم توشی نەخۆشیەکی پیس بوومە چارم نەماوە.. بابە گەر منت فەوتان توخودا

خوشکەکانی دیکەم مەفەوتێنە، تکا دەکەم بابە گیان ئاگات لێیان بێ با بەویستو ئارەزووی خۆیان هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن، زۆریان لێ مەکە، چاوت لەدایکیشم بێت گەلێك ماندووە, بەڵام داخەکەم ناتوانم بێمەوە یارمەتی بدەم، ناتوانم وەك جاری جارانیش خەونی جوان ببینم، چونکە رەنگی هەموو خەونە جوانەکانی کچێنیم لەگەڵ لەبەر کردنی کراسی بوکێنیم سپی بوونەوەو هیچ شیکردنەوەکیان بۆ نەما، پێکەنینو قسە خۆشەکانم وەکو ئەڵقەکەی پەنجەم سنوریان بۆ پەیدا بوو، بابە گیان نامەوێ هیچی دیکە بڵێم چونکە تۆ منت قبوڵ نیە بگەڕێمەوە نەبادا خەڵك قسەت پێ بکەن، منیش قبوڵم نیە بابم خەڵکی لەمن خۆشتر بوێ، جا تکا دەکەمو دەیڵێمەوە خوشکەکانی دیکەم نە بیانبەخشەو نە بیانفرۆشە، لە کۆتاییدا هیوادارم هەر لەخۆشیدا بنو هەردەم شادبن..

کچە بەدبەختەکەت

نامۆ"

. ئێ نامۆ لەماڵی مامەی چی بەسەرهات..؟

ـ دوای ئەوەی یەکەمجار بەو شێوە خۆی نەخۆش کرد بیری لێ کردەوە کە ئەم پلانە سەری نەگرتو دەبێ بیر لە پلانێ دیکە بکاتەوە تا خۆی رزگار بکات

. باشە هێندە بێزار بوو لە پیاوەکەی..؟

. بەڵێ دەزانی بۆ..؟

. بۆ..؟

ــ پیاوەکەی بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نامۆدا نەدەکرد، بەردەوام چارەیەکی گرژو مۆنی هەبوو, جنێوی ناشرینی پێدەداو بەرۆژ لێی نەدەپرسیەوە، تەنها بەشەو نامۆی بیر دەکەوتەوە، نامۆش بێزار بوو لەو ژیانە بێتامە، نەیدەویست مانەوەی ئەو تەنها بۆ لەزەتو تێر کردنی پیاوەکەی بێت، دەیویست بەختەوەر بژێت, بۆیە ئارەزووی نوستنی لەگەڵدا نەدەکرد, پیاوەکەی شەوان بە زۆر مومارەسەی جنسی لەگەڵدا دەکردو ئەزیەتی دەدا.. هەموو جەستەی شینو مۆر دەکردەوە وەك ئاژەڵێك لە تەکیدا دەخەوت، کە تەواویش دەبوو جێگەکەی خۆی لە نامۆ دوور دەخستەوە, کە رۆژیش دەبووەوە بەیانی دەکرد کە نامۆ لەگەڵی نانوێو شەوانە بەتەنیا دەخەوێ..

. ئێێێ ..؟

. نامۆ خراپ نەخۆشکەوت توشی سەر ئێشەیەکی پیس هات, نانو ئاو خواردنەوەی نەما، پیاوەکەی بە دایکی ووت کە بیابات بۆ لای دکتۆر بزانێ چیەتی، بەر لەوەی

بېرێته لای دکتۆر نامۆ بیری لە نوسینی نامەیەك کردەوە و نامەیەکی نوسی تا ئەگەر گەیشتە نەخۆشخانەکە هەرچۆنێ بێت بە دزیەوە بیداتە دەستی دکتۆرەکە، هەر کە گەیاندیانە ئەوێ نامۆ نامەکەی تەسلیم کرد، دکتۆرەکە سەری لەو کاغەزە دەرنەچوو کە کچێکی وا بێ ئەوەی بیناسێ شتێك بداتە دەستیو نەزانێ چی تیا نوسراوە

. ئێ..

ـ دکتۆرەکە روخسەتی وەرگرت.. تا چووە ئەو دیوی پەردەکە هەزارەها شت هاتە خەیاڵی، لە نامەکەدا هاتبوو:

" دکتۆر گیان..

بمبەخشە رەنگە توشی شۆك هاتبی کە ئەم نامەیەم دایە دەستت بەڵام مەبەستێکم هەیەو دەمەوێ بیپێکم.

دکتۆر گیان رەنگە رونکردنەوەی زۆر شت لێرەدا گرنگ نەبێ بەلای تۆوە, بەڵام دەمەوێ هەندێ راستیت بۆ بدرکێنم, بۆیە ناچار بووم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم، ئێستا من ژنی ئامۆزایەکی خۆمم کە بەداخەوە دەیڵێم بێ ویستی خۆم منیان دا بەو, ئەویش بە بێ ویستی خۆی منی مارە کرد لە خۆی.. من لەترسی باوکم ئەو لەشەرمی مامەو تۆڵەی باوکی، تەمەنم حەوت ساڵان بوو بیرم دێ سەردانیماڵی مامەمان کرد، هێندەم بیرە کە مامەم لەو شارە بانگکرابوو کە زۆر کەس خۆی دەکردە خاوەنی ئەو شارەو لە بێ خاوەن دەچوو، ئەو رۆژە بەر لەوەی بچێ بۆ ئەو شارە ماشێنێکی هەبوو دایە دەستی باوکمو پێی ووت:

" برا من رەنگە نەگەڕێمەوە بێ گومانم کە ناتانبینمەوە بەڵام تکا دەکەم چاوت لە ماڵو منداڵم بێ ئەم ماشێنەشت با بەدەستەوە بێ هەم خۆتانی پێ بژێنەو هەم ماڵو منداڵی من". ئاوڕی لە باپیرەشم دایەوەو ووتی:

" باوکە منداڵەکانم ئامانەتی تۆ لەگەڵیان دانیشە لەم خانوەدا با بەتەنیا نەبن.. خواحافیز"

ئیدی مامەم رۆییو نەگەڕایەوە لەگەڵ چەند رۆحێکی دی سەرنگومیان کردو دەرخواردی دەعبا برسیەکانی بیابان کران، دوای چەند ساڵێك باپیرەم خانووەکەی فرۆشتو باوکم ئامۆژنمو منداڵەکانی لەگەڵ خۆمان دانیشاند، ساڵێك پێکەوە ژیاین، باوکم زۆر یارمەتی دەدان زیاتر لەوەسیەتەکەی مامم ، بەڵام ئامۆژنم بەوەندە قایل نەبوو بۆ ئەوەی ئۆتومبیلەکە بداتە دەست براکانی خۆی, شکاتی لە بابم کرد بەوەی ماڵی ئەوانمان خواردووە،

بەهەرحاڵ بەکورتی بیبڕێنمەوە خاڵەم باوکمی بەرداو ماشێنەکەیان بردەوە، ئیدی بۆ ماوەی حەوت ساڵ بە هیچ شێوەیەك قسەمان لەگەڵ ماڵی مامم نەدەکرد، دوای ئەو حەوت ساڵە من گەورە ببووم کچێکی جوانی ناو گەڕەکی خۆمان بووم, هەموو کچان ئیرەییان بەجوانیم دەبردو کوڕانی گەڕەکیش هەموو شێتی ئاوڕدانەوەیەکم بوون، زۆر هاتن ژنداروبێ ژن داوایان دەکردم ئەفسوس جوانیم بە هەدەر چوو دکتۆر، دوای ئەو حەوت ساڵە بێ ئەوەی بیر لەو کوڕە مامە بکەمەوە کە بە منداڵیش رقم لێی دەبووەوە باوکم بڕیاریدا بە دیاریو بە کراسی بەرم بمدا بەو، لە تۆڵەی پارەی خانو سەیارە، نزیکەی سێ مانگ دەبێ من لەم دۆزەخەدا دەژیم ناوێرم هیچ قسەیەك بکەم پێم دەڵێن:

"باوکت پیاوەتی لەگەڵدا نەکردوین لە باتی سەیارەو خانو تۆی داوە بە ئێمە".

هەموو کاتێکم مردنێکە, نازانم چی بکەم پیاوەکەشم سەرەڕای ئەم هەموو شتە دڵم لێ پیس دەکاو خراپە لەگەڵم وەك ئەسیرێکی بە دیل گرتبێ وا رەفتارم لەگەڵ دەکا، شەوانیش زۆر ئازارم دەدات، بمبورە کاتێ ئەم شتە بێ مانایەت بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام وەرە بە ئامۆژنم بڵێ بمبەنەوە ماڵی بابم بەر لەوەی بمرم یان خۆم خۆم بکوژم. دکتۆر گیان بەرگەی خەمی دیکە ناگرم ماندوو بووم لەگەڵیان تکا دەکەم تکا دەکەم هاوکاریم بکە.

کچە بێ هەتوانەکە

نامۆ"

دکتۆرەکە سەری سوڕماو تێك چوو وەك ئەوەی لەم جیهانەدا نەبێ سەیری بەم دێڕانەدا دەهات..! هاتەوە ئەم دیوی پەردەکەو دەستی خستە ناو دەستی نامۆو پێی ووت:

"گوڵە گیان دڵنیابە ئەوەی بەمن بکرێ دەیکەم بۆت"

نامۆ بە گەرویەکی پڕ لە گریان پێی ووت:

سوپاس دکتۆر گیان

دکتۆرەکە هێڵکاریەکی دڵی بۆ کردو تەماشای کرد کە بەڕاستی نامۆ نەخۆشە دڵی زیاد لە 150 ترپە لێدەدات, چاوەکانی پڕ بوو لە ئاو، بۆی دەرکەوت کە نامۆ زۆر ماندووەو بەڕاستی پێویستی بە پشوو هەیە بەڵام لە هەمان کاتدا دەیویست دڵی نامۆ لەگەڵ ماڵی مامەیدا

ئاشت بکاتەوە، ئامۆژنی بانگکردە ژورەکەی خۆیو پێی ووت:

دادە ئـــەم بوکـــەتان زۆر نەخۆشـــە, دڵـــی زۆر هیلاکـــە, پیاوەکەی باشە لەگەڵی؟

- ئـەرەوەڵڵا دکتـۆر ئـەوەی لـە بـازار هـەبێ بـۆ ئـەم کچـەی هێناوەتەوە

- بەڵام ئەوە بەس نیە بۆ ئەوەی دڵی ئەم بوکەتانی پێ خۆش بکەن

. لەوە زیاتر چی دەوێ دکتۆر بەخوا ئەمە سەدەمین جارمە دکتـۆری پـێ دەکـەم, چ خەسـویەك وای بـۆ دەکـا..؟! ئـێ کوڕەکەشـم زۆر بـە گلەییـە لـە دەسـتی ئـەڵێ دایـە هـیچ روویەکم ناداتێ وا دەزانێ دوژمنی ئەوم کاتێ لێی دەچمە ژورەوە.

دکتۆرەکە لە دڵی خۆیدا ووتی: سەیرە

دادە گیان ئەم بوکەتان دڵی مانـدووە گـەر خەفەت نـەخوا دڵی هێندە پەلە لێنادات, دەبێ یارمەتی بدەن, مـن ئێسـتا هەنـدێ حـەبی بـۆ دەنووسـم تـا لێـدانی دڵـی بێتـەوە بـاری ئاسایی خۆی، ئێوەش بزانن چی دەوێ بۆی بکەن، خۆ خـواردن‌و گـەڕان کـافی نیـە بـۆ دڵخـۆش کردنـی مرۆڤێـك، ئەگەر ئاسودە نەبێ بە شوێنەکەی.

. باشە بەسەرچاو

لە ژورەکە هاتنە دەرەوەو هەردووکیان روویان کردە نامۆو دکتۆرەکە بە نامۆی ووت:

گوڵە گیان تۆ پێویستیت بە پشویەکی زۆر هەیـە بـە کـوێ دڵت دەکرێتەوە پێمان بڵێ با ئامۆژنیشـت بزانـێ‌و دوایـی قسە لەگەڵ پیاوەکەت بکات؟

نامۆ:

. بە ماڵی باوکم دڵم دەکرێتەوە دەمەوێ دایکم ببینم

ئامۆژنی:

باشە دەتبەینەوە بۆ ئەوێ تا چاك دەبیتەوە.

من کە گوێم لەم قسانە دەبوو خەریك بوو دەگەڕامـەوە نێـو دیوارەکـان‌و لـە ئاوێنەکـە بـەدەر دەهـاتم، نامـەکانی نـامۆ خەریك بوون شێتیان دەکردم، لەوم پرسی:

. ئێ بردیانەوە بۆ ماڵی باوکی..؟

. تۆ بوەستە با بۆتی باس بکەم

. دەدەی دڵم تەقی بەخوا خەریکـە مـن دەبمـە شـێتە شـێت دەبم بـــەدوای نـــامۆدا، ناحـــەقی شـــێتە نـــاگرم، بۆچـــی ئارەزووی کردووە نامۆ بناسێ

. نەیانبردەوە بۆ ماڵی بابی.. بەو دەردەوە مایەوە, چەند ڕۆژێکی بەسەر چوو هەروا نەخۆش بوو، شەوێکیان پیاوەکەی لێی هاتە ژورەوەو ویستی بەزۆر رووتی بکاتەوەو لەگەڵیدا رابوێرێ بەڵام نامۆ هێندە نەخۆش بوو توانای هیچ شتێکی نەبوو، قێزیشی لێ دەکردەوە، بۆیە وەکو هەموو شەوانی پێشووی ئارەزووی خەوتنو جنسی نەدەکرد لەگەڵیدا، پیاوەکەشی لە داخی هەڵچوونی غەریزەکانی وەکو هەموو شەوان بەزۆر لەگەڵیدا رایبواردو چڵکاوەکەی خۆی رژاندە سەرو دەموچاوی، جا دواتر لێیشیداو ئەزیەتێ زۆریدا بۆ ئەوەی دەنگی ناڵەو گریانەکانی دەرنەچێ، دامێنی بەتانیەکەی نایە دەمیەوە، نامۆ خەریك بوو بخنکێ بۆیە بەرێکەوتی زانی ئەمجارە فێڵێکی دیکە بدۆزێتەوەو خۆی قوتار بکا، کە زۆر دڵنیابوو لەوەی سەر دەگرێ، بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی کەڕو لاڵ کرد, هەرچیان هێناو برد وەك ئەوە وابوو لای نامۆ نەبای دیوە نەباران، ئامۆژنو خزمەکانی پیاوەکەی سەریان سوڕما لەوەی ئەم کچەیان هێنا عەیبی نەبوو، کەچی لەوەتەی هاتووەتە ئەویێ هەموو رۆژێك نەخۆشەو ئێستا کەڕو لاڵیش بووە، دانیشتنێکیان لەسەر ئەوە کرد کە بەر لەوەی بمرێ بیبەنەوە ماڵی بابی و بڵێن:

"ماڵتان ئاوابێ کچی خۆتان بۆ خۆتان ئێمەش کوڕی خۆمان بۆ خۆمان"، بەو شێوەیە نامۆیان بردەوە لەوێندەریش کاتێ باوکی چاوی بە نامۆ کەوت کە کەڕو لاڵ بووەو بەر لە چەند رۆژێکیش بە نامەیەك پێی راگەیاندووە کە زۆر نەخۆشە, خەریك بوو تێك بچێ باوەشی بە نامۆدا کرد، خۆیو ماڵی براکەی تاوانبار کرد کە ئەوان هۆی کەڕو لاڵ بوونی نامۆن، باوکی لەماڵی براکەی خۆی کە ماڵە پیاوی نامۆ بوو تورە بوو پێیانی ووت کە کچی نەداوە پێیان تاکو ئاوا بە مردوویەتی بۆی بگەڕێننەوە، بڕیاری دا کە نامۆ ناداتەوەو با بچنەوەو تەلاق نامەی بۆ بنێرنەوە، لەویێ نامۆ هەستی کرد کە پلانەکەی سەری گرتو کارێ وای کرد هەم ئەوان بیهێننەوە ماڵی باوکی هەم باوکیشی نامۆ بگرێتە باوەشی وەك جاری جارانو هەم خەڵکیش هەقی ئەوەی نەما بڵێن کچە بۆچی گەڕایەوە، چونکە نامۆ بەم پلانە بۆ هەموو خەڵکی سەلماند کە بە مردوویەتی گەڕاندویانەتەوە، نامۆیان برد بۆ لای سەیدو هەندێ دوعایان لەسەر خوێند.. نامۆ زمانی خۆی کردەوە کە گوایە سەیدەکە چاکی کردووەتەوە، لە بەرچاوی باوكو براکەی دەستی سەیدەکەی ماچ کردو گریانێکی بە کوڵ

گریا، هەموو ئەوانەی بۆ لای سەیدەکە هاتبوون گەروویان پڕ بوو لە گریە بە گریانەکانی نامۆ.
بۆ ماوەی سێ مانگ لە ماڵی باوکی مایەوە لەو ماوەیەدا خـولی مانگانـەی نـەبوو, بـۆ ئـەو مەبەسـتە سـەردانی پزیشکی کرد, لە تاقیگەدا بۆی دەرکەوت کە سکی پڕە لە ئامۆزاکـەی، وەختبـوو شـێت بـێ، لـەناو نەخۆشـخانەکە دەستی کـردە گریـانو هـاواری ئـەوەی دەکرد دەرزیـەکی لێبـدەنو منداڵەکـەی نـاو سـکی بکـوژن، هـەموو پزیشـكو پەرستیارەکانو نەخۆشەکانی لەو نەخۆشخانەیە بوون بە چـاوێکی سـوکەوە تەماشـایان کـرد، بڕیـارو قسـەی ناشرینیان بۆ هەڵبەستو بە جنێو دەریان کردە دەرەوە، وای بۆ دەچوون کە ڕەنگە نـامۆ زۆڵێکی لـە سکدا بێت، وایـان دەزانـی بۆیـە دەگـریو دەیـەوێ سکەکەی لە باری خۆی بچوێنێ چونکە لەگـەڵ کوڕی کۆڵاندا ڕاییبـواردووەو سـکی لێ پـڕ کـردووە، نـامۆ لـەتاو ئـازاری ڕۆحو ئەشـکەنجەی ئـەو قـەدەرەی دەیگەڕێنێتـەوە مـاڵی مـامی پەرێشـان بـوو، گـوێی لـە قسـەی هـیچ کەسێکیان نـەبوو، زۆری هێنـاو بـرد داوو دەرمـانی دونیـای بـەکار هێنـا بـۆ ئـەوەی سـکەکەی لـەبار خـۆی بچـوێنێ بـەڵام منداڵەکـە هێنـدەی دی شـوێن خـۆی قـایمتر دەکـردو هێنـدەی دی ئارەزووی بـۆن کردنـی جـەرگو دڵـی دایکـی دەکرد، نـامۆ بـەم حاڵـەو بـەم ئـازارەوە سـێ مـانگی دیکـەش تلایـەوە.. ناوقەدە باریکەکەی نامۆ نەماو سکی بەرزەوە بوو، دایکی هەستی پێ کردو ووتـی:

ـ چیە نامۆ دەڵیی سکت هەیە..؟!

ـ سکی چی نا وانیە

ـ کچـم تـۆ سـکت هەیـە دیـارە پێتـەوە بـا بچین بـۆ دکتـۆر بزانین

نامۆ وای لەخۆی کرد کە هیچ نـازانێ لەگـەڵ دایکی چوو بۆ دکتۆر لەوێندەر دایکی بۆی دەرکەوت کە سکی شـەش مانگـە منداڵەکەشـی کچـە، نـامۆ دەسـتی کـرد بـە گریـەو ووتی نامەوێ بگەڕێمەوە نا

ـ کچم ئەی ئەو منداڵە چی لێدەکەی..؟

ـ فڕێیدەدەم

ـ بەچی فڕێدەدرێ تازە وا جێگیربووە ناکەوێ".

نـامۆ چـەند مـانگێکی دیکـە دەبـێ بـە دایـك, بـەڵام دەبـێ دەوری چ دایکێـك ببینـێ, کـە خـۆی هێشـتاکە منداڵـەو بەدەوری دایکیدا دەخولێتەوە، نامۆ چۆن منـداڵی بۆ ژێر دەکرێتـەوە کـە خـۆی گـەر بگریـێ پێویسـتی بـە کەسێکە

ژیری بکاتەوە، چۆن سۆز بداتە منداڵەکەی کە تێر سۆزی دایکی نەبوبێ و وانەیەکی لێ فێر نەبوبێ..؟
نامۆ نەیدەزانی چی بکات, سەرەرای ئەوەش ئەوەندە دڵی بە کچەکەی ناو سکی خۆش بوو کاتێ کە دەجولایەوەو هەستی دەکرد پێی دەوت دایە، هێندە هەستی بەو خۆشیە نەکردبوو لە هەموو تەمەنیدا، نامۆ نەیدەزانی دەمرێ یان دوبارە دەژییێتەوە، یان مرۆڤێکی دی دەهێنێتە بوون نە هەوەسی بە چارەی باوکی دێ نە دەزانی چۆن بەخێوی بکات، چاوی مرۆڤێك بەدونیا هەڵدەهێنێ کە هیچ لە دونیا نازانێ، رۆحێك لە پەنا دیوارەکانی خەم و پەژارەو لە هاوار هاوارەکان و لاقەی شەوانی دروست بووە، رۆحێك لە گریانەکانی نامۆو بوغزەکانی پیاوێکی ناشرین دەیەوێ بێتە بون، رۆحێك دەیەوێ ببێتە ئاشتکەرەوەی دایك و باوکی، نامۆ دەیپرسی دەبێ چ منداڵێك دەرچێ..؟ رەنگە ئاگای لە هەموو ئازارەکانی دایکی هەبێ، رەنگە هەموو ئەو دڵۆپە فرمێسکانەی نامۆ قوتی دەدانەوە منداڵەکە هەڵیمژیبێ، تۆ بڵێی ئەویش وەك دایکی دەرچێ..؟ هەر وەك نامۆ بەردەوام چاو بە فرمێسك و بەدبەخت و نگبەت بێ، خۆ جوانیشە وەك نامۆ ژیرو تێگەیشتوو بێ.. لەپێناو سەلماندنی بوونی خۆی و جوانکردنی ژیانی لە بەرامبەر ئاوێنەی جیهانێکی نابەڵەددا تێبکۆشێ، رەنگە بەر لەوەی بژێت بمرێت. ئاخ.. نامۆ تازە دەبێ بە دایك و دەبێ دایکێکی راستەقینە بێ بە پێی داب و نەریتە کۆمەلایەتیەکان دەبێ لە پێناو منداڵەکەی هەموو شتێکی قبوڵ بێ.
هەموو خزم و دۆست و برادەرو دایك و باوك لە دەوری خڕ بوونەوەو ناردیانە دوای ماڵە پیاوی تاکو بێت بیباتەوە چونکە سکی پڕەو نایانەوێ تەلاق بدرێ، بەلام پیاوە بەدو ناشرینەکەی درۆی دونیای بۆ دروست کرد کە گوایە ئەو منداڵە لەو نیەو خودا دەیزانی هی چ پیاوێکە، بۆیە نامۆ بڕیاریدا هەرچۆنێك بێت منداڵەکەش فڕێبداو لە باری خۆی بدا باشترە لەوەی باوکی خۆی نەکاتە خاوەنی، بەلام هەرچ کاتێك نامۆ دەیویست ئەو کارە ئەنجام بدا منداڵەکە لەناو سکی دەجولایەوەو ئازاری لە جەرگی نامۆوە دەهێناو پێدەچوو بە نامۆی دایکی بڵێت: "نەکەی دایە نەکەی فڕێمدەی من لە پێناو مانەوەی تۆ دێمە بوون دایە گیان".
هەرچۆنێك بوو ماڵە پیاوی نامۆیان بردەوەو بەلام نامۆ هێندەی دی نەخۆش کەوت و ئەمجارە بەراستی لە زمان

کەوت ئەوەی بەدەمی دیواردا بهاتەیە بەدەمی نامۆدا نەدەهات، چونکە نامۆ هەموو پلانەکانو ئاواتەکانی دۆڕاندو گەڕایەوە نێو ئەو قەدەرە داخراوەی نەك دەستو پێ، تەنانەت خەونو هیواکانیشی بە ژیان بەسترانەوە، ئەمجارە ماڵی پیاوی تەواو لێی بێزاربوون زوو زوو پیاوەکەی شەڕی پێ دەفرۆشتو پێی دەووت:

کوڕت نەبێ ناهێڵم یەك خولەك لەم ماڵە دانیشی

نامۆ ووتی: ئەی ئەگەر کچ بوو..؟

. خۆتو کچەکەت دەکوژم

. حەدت چیە شتی وا دەکەی

ئیدی بەربووە گیان نامۆ هێندەی لێدا هەموو جەستەی شینو مۆر کردەوە، پرچی بەسەرەوە نەهێشت هێندە بیگریو لەم سوچ بۆ ئەو سوچی ژور هەڵیداو لەو سوچ بۆ ئەم سوچی ژور، جا مقەستی هێنا تا بیکاتە سکی نامۆو بیکوژێ, لەو کاتەدا لەگەڵ هاوارەکانی نامۆ دراوسێکانی فریای کەوتنو دەستی پیاوەکەیان گرت، نامۆ لەتاوا رای کردە چێشتخانەکەو دراوسێکان بەدوایەوە گەر دەستیان نەگرتبا چەقۆیەکی لە سەر دڵی خۆی دەچەقاند، رێکەوت ئەو ئێوارەیە "کارۆ"ی برای گەیشتە ئەوێ بینی سەرو دەموچاوی نامۆ شکاوەو جلەکانی لەبەردا دڕاوە, توشی شۆك هاتوو لێی پرسی:

. چیە ئەوە..؟

. هیچ

. پێت دەڵێم چیە ئەوە کچێ..؟

. باوکم دەزانێ

. ئامۆزا لێیداوی..؟

. بەڵێ براکەم, وەرە با بڕۆینەوە من یەك کاتژمێر دی لێرە نامێنمەوە بمبەرەوە

. خۆت بپێچەرەوە ئێستا منیش دەچم یەك بلۆك دەکێشم بە سەریداو دەیکوژم پاشان دەڕۆینەوە"

نامۆ کەوتە دەست پێ ماچ کردنی براکەیو تکای لێ کرد کاری وا نەکات, وا باشترە زوو بڕۆنەوە، بەپەلە دو پارچە جلی کردە ناو جانتاکەیو هەندێ پارەی کاغەزی هەڵگرت بۆ ئەوەی ئامۆژنی هەست نەکات رادەکات، دەرگای ژورەکەی خۆی داخستو جلی دەرەوەی پۆشی جا ماکسیەکەشی لەسەر جلەکان کردەوە بەری تا ئامۆژنی لەماڵێ چووە دەرەوە، ئەو کات کراسەکەی فڕێداو لەگەڵ براکەی دوو بە دوو رایانکردو گەڕانەوە ماڵی باوکیان، کاتێ باوکی چاوی بە نامۆ کەوت بەخۆیو

جانتاكەی گەڕاوەتەوە وەختبوو شێت دەبوو, بەڵام لەوێندەر نامۆ باسەكەی بۆ گێڕایەوەو ووتی ئەمجارە ناچمەوە گەر لە مليشم بدەی، باوكە رەشتاڵە سەرو سيما بە سامەكەی هەردوو برۆكانی لە شێوەی حەوت بەيەكداداو بە دەنگێكی قەرخ يەك بە هۆڵەكە هاواری كردە سەری:

"هەر ئێستا دەڕۆيتەوە تێگەيشتی..؟

. توخوا مەمنێرەوە باوكە گيان ناچمەوە توخوا"

باوكی هەستا شەپازلەيەكی پيا كێشاو هاواری لە پارچەيەك سۆندە كرد تا لە نامۆی پیّ بدا, دايكی تاوی دایی‌و بە چاوی پڕ لە فرمێسكەوە ووتی:

. چيە كچم بۆ تۆ دۆزيوەتەوە وای لێدەكەی كافری كافر باب, ئەو كچەت كوشت, لێرە تۆ لێدەدەيت‌و لەویّ پياوە سەگبابەكەی، بەقورئان دەستی لیّ بەرز بكەيتەوە يەك سەعات لێرە دانانيشم‌و كچەكانيشم لەگەڵ خۆم دەبەم، ئايييييی خۆ دڵم تەقی.

. وەلبەو لاچۆ لەبەرچاوم بەخوا تۆش دەكوژم

نامۆ بەقوربانی باوكی بوو لێی پاڕايەوە, دايكيشی دوور خستەوە تا لەسەر ئەو قسە نەكات، با لەبەر ئەو ناخۆشی نەكەوێتە نێوانيان‌و دايكی بتۆرێ، گريانی منداڵەكانيش ئەو حەوشەيان پڕ كردبوو، نامۆ لە داخدا پەلاماری بەرميلە نەوتەكەی دا تا خۆی بسوتێنیّ, براكەی دەستی گرت‌و نەيهێشت، ئيدی باوكی هاواری لە دايكی نامۆ كردو پێی ووت:

"هەر ئێستا دەچی ئەو منداڵەی سكی فڕێدەدەی، خێرا خێرا دەی گەر بە پياوەكەی رازی نيە با منداڵيشی نەوێت".

دراوسێكەيان هات هێوريانی كردەوەو نەعلەتی شەيتانی پیّ كردن، نامۆ بەم حاڵە مايەوەو ئاگای لەماڵە پياو نەما, بەڵام باوكی بە هيچ شێوەيەك قسەی لەگەڵدا نەدەكرد، تەنانەت ئەو رۆژەی نامۆ منداڵەكەشی لە رۆحی جيابۆوە، رۆژێكی ساردبوو نامۆ كچەكەی لە يەكەم رۆژی بەهار بوو، بۆيە نامۆ ناوی كچەكەی نا "بەهار" كچێكی خرپنی جوان هەر لە بەهار دەچوو ئەو كچە بۆ نامۆ مانای ژيانەوە بوو، هەرچەندە نامۆ لە هەمو تەمەنيداو بەتايبەت دوای لەدايكبوونی كچەكەی بەسیّ سالّ بەردەوام خۆی لە نێو گەڵا هەڵوەريوەكانی پايزدا دەبينی‌و لە ئاوێنەی خەزاندا تەماشای روخسارە زەرد هەڵگەڕاوەكەی خۆی دەكرد، سیّ پايز لەگەڵ وەرينی گەڵاكان هيواكانی هەڵدەوەرين، سیّ پايز نامۆ رۆژانە دەمردو دەنێژرا لە

چاڵی خەم، چونکە لەو سێ ساڵەدا کە تەمەنی کچەکەی بوو باوکی بە هیچ شێوەیەك رووی نەدایە "بەهار"ی کچی، نامۆ بەلایەوە گرنگ نەبوو قسە لەگەڵ ئەودا ناکات، بەڵام زۆر دڵی بەوە خۆش دەبوو گەر بۆ جارێکیش باوکی گەمەی لەگەڵ بەهاری کچیدا بکردایە، بەهاریش بەو تەمەنە گچکەیە منداڵێکی ژیر بوو لە هەموو شتێك حاڵیی دەبوو، بەڵام ئیدی کچی ئەو دایکە بوو دەبوو وەك دایکی نامۆ بێت بە هەموو شتێك، نامۆ لەو ماوەیەدا لەگەڵ چۆلەکەو کۆترەکاندا قسەی دەکردو دەیووت:

"باڵدارەکان وامەزانن ئارەزووی فڕین ناکەم لەگەڵتان، وامەزانن ئارەزوی هێلانە ناکەم لەنێو کۆشی گەڵاکان، بەڵام چی بکەم کە باڵەکانم هێندە کورت بن توانای فڕینیان نەبێ, یان دەنوکم هێندە لار بێ نەزانێ هێلانەیەك دروست بکات تا خۆم بێچوەکەمی تیا بسرەوین، بۆیە رەتی هەموو فڕینەکان دەکەمەوەو پرچی دارەکان دەڕنمو دەیاندەم لەیەخەم, تا وەرزێکم هەبێ گوێ لە شەقەی باڵی فڕینەکانی رۆحم بگرێ، باڵدارەکان.. دەزانن منو پایز هاوڕێی یەکین هەردوکمان خەمخۆر یەکین، هەر وەك دوانەش سیمایەکی زەرد ئەپۆشین هەموو جارێ لە چەند ساتێك پێکەوە دائەنیشین تا باسی خۆمان بۆ یەکدی بکەین، من فرمێسکی بۆ هەڵئەڕێژم تا چاوەکانم کز دەبێ، ئەو زیاتر لە تنۆکی فرمێسکەکانم گەڵا بە دارەوە ناهێڵێو هەموویم بۆ هەڵدەوەرێنێ، من بە هەناسەیەکی سارد دەرونیشم پڕ لە ئاگر ئاخی لە بۆ هەڵدەکێشم، کەچی ئەو هێندە جەرگی بە داخە بە بایەکی وشكو دڕن هەموو پێستەم ئەقلیشێنێ، ئەو تینوی گۆمە ئاوێکە خاکی وشکی پێ تەڕ بکا، منیش تینوی کانیەکم دەمم بنێم بە دەمیەوە هەڵیمژم تا تێری لێ دەخۆمەوە، نازانم ئەو لە منە یا من لەوم..؟ لەوانەیە هەر من لەو هاتبمە کاوە بۆیە وەك رۆخسارێکی زەرد ئەپۆشم، لەوانەشە تا ئەو رۆژەی یەزدان گیانم ئەباتەوە گەڵای رۆحیشم هەڵدەوەرێتو سیس دەبێ ئەسپی حەزم تینوی یەك بەهارێك دەبێ".

رێکەوت لە رۆژێکدا لە بن هۆڵێکی تاریك، دوای سێ ساڵ تەمەن بۆ یەکەمجار باوکی بانگی لە بەهار کردو گەمەی لەگەڵدا کرد، ئەم گەمە کردنە گەمەی نامۆ بوو لە فیردەوسێك کەس خەونی پێوە نەدیبوو، نامۆ منداڵی خۆی بیرکەوتەوە کاتێ بەر لەوەی براکەی لەدایك بێ باوکی هەمان گەمەی لەگەڵدا دەکرد، هەستیکرد دوو باڵی هەیەو دەفڕێ بەئاسمانێك تا ئێستا هیچ باڵدارێك

نەیتوانیوە بفرێ لێی، پەیامێکی پێ گەیشت بە هیچ پێغەمبەرێك نەگەیشتووە، بەلام ئەفسوس ئەم خۆشیەی تا سەر نەبوو گەمەکانی باوکیشی هێندەی نەخایاند, بە رۆژێ دوای ئەوە بە نەخۆشی دڵ گیانی لەدەستدا.. ناموٚ باوکی مرد بە رۆژێك دوای ژیانەوەی نامۆ، تا ئەمرۆش چ نامۆ چ بەهاری کچی یادی ئەو رۆژە دەکەنەوەو دەگەنە کێ چیرۆکی ئەو رۆژەی بۆ دەگێڕنەوە کە باوکی بەو رۆحە ماندووەوە کە بەدیوارەکانی مردندا هەڵدەزنا، گەمەی لەگەڵ بەهاردا کرد .

## بەشی چوارەم

ووتی:

شێتە کاتێ نامەکەی دیکەی نامۆی خوێندەوە توشی سەرسامیەکی زۆر هاتو تا چەند رۆژێك بیرو هۆشی لای خۆی نەمابوو بەلام گەر "هەریاد"ی خۆشەویستی نەبوایە کە خۆی ناوی لێ نابوو چونکە هەموو کات لە یادی بوو، هێندەی دی تێك دەچوو، شێتە کوڕێکی خۆشدەویست لە خۆی شێتتر بوو، شێت بەو مانا لاسایکردنەوە نا.. ئەو شێتانەش نا کە عەقڵیان لەداست داوەو لەسەر شەقامەکان دەسوڕێنەوە بەڵکو شێتی شێتەو شێتی خۆشەویستەکەی بە تێگەیشتن و تێڕوانینی خەڵك بوو گەر نا هیچیان شێت نەبوون، ئەوە خوێندنەوەی مرۆڤە ناشرینەکان بوو بۆ ئەو دوو کەسە چونکە لەوان عاقڵتر بوون زۆر جاریش خۆیان دەگەیشتنە ئەو بڕوایەی کە شێتن چونکە هەموو کارو کردەوەو قسەکانیان لە مرۆڤەکانی دی نەدەچوو، جیاواز لە هەموو بونەوەرێك دەژیان، شێتەو هەریاد نەدەکەوتنە ژێر کاریگەری کەسەوە جگە لە بڕیارەکانی خۆیان، هەموو ئەوانەی لەدەورو پشتیان بوون ئێرەییان پێ دەبردن بە بێ

ڕەوشت لە قەڵەمیان دەدان، چونکە ئەوان گوێیان نەدەدا بە هیچ و دڵی یەکدیان نەدەشکاند بە قسەی خەڵکی، هەرچەندە کەمیان نەکرد تا شێتە لە خۆشەویستەکەی بکەن بوختانی زۆریان بۆ هەڵبەست لە پێناو ئەوەی هەریاد وازی لێ بێنێت و رقی لە شێتە ببێتەوە بەڵام کوڕەکە هێندەی شێتە خۆشدەویست کە زۆر جار نەیدەزانی بە چ مەبەستێك ئارەزووی نزیکبوونەوەی دەکات، بۆی ببوو بە هەموو کەس.. وەك هاوڕێیەکی دڵسۆزو بەوەفا رەفتاری لەگەڵ شێتەدا دەکردو دەیزانی چی روو دەدا بێ ئەوەی شێتە ئاگای لە دەورو پشتی بێ، دەیزانی پیاوە ناشرینەکان بۆ دەیانەوێ ئەوی لێ بکەن، چەند جارێك شێتەیان لە ژورەکەی هەریاد دەردەکردە دەرەوەو هەریادیش لەسەر شێتە بەشەڕ دەهات, شێتە بۆ ئەوەی ژیان لە هەریاد نەشێوێنێ, جارێك بڕیاریدابوو دور بکەوێتەوە لێی, تاکو خۆشەویستەکەی بە ئاسودە بژێت, نامەیەکی بۆ نوسیبوو بە دەستی خولیای خوشکی بۆی ناردبوو, لە نامەکە هاتبوو:

"سلاو..

وەك دیارە من هەموو کێشەیەکت بۆ دروست دەکەم, بۆیە بەیەکجاری ئەبێ بڕیار بدەم دور بکەومەوە تا ئەتوانم دور بکەومەوە لەم بیابانەش, چونکە ناتوانم لە جێگەیەك بژیم و تۆی لێبیت و نەتوانم بتبینم و قسەت لەگەڵدا بکەم, بمبورە گەر دڵم ئێشاندووی بمبورە تکا دەکەم, بمبورە گەر هەرچ کێشەیەکم بۆ دروست کردبی, بمبورە گەر نەمتوانیوە لێت تێبگەم وەك خۆت دەڵێی, بمبورە گەر بەجێمهێشتوی لە کاتی جێهێشتنا, وا دیارە من و تۆ دوو سنوری جیاوازمان هەیە, ناتوانین ئاشنای یەك بین, بمبورە گیانەکەم.. پێویست ناکات هیچ خۆت دڵگران بکەیت لەسەر من, من شایەنی ئەم هەموو رێزو سۆزە نیم, من بچمە سەر چ دەریایەك وشك دەکا, بۆیە لەبەر من ژیان لە خۆت و لە کاری خۆت تێك مەدە, دڵ خۆت تەنگ مەکە تکات لێدەکەم, ماڵئاوا خۆشەویستەکەم".

لە پشت لاپەڕەکە نوسیبووی:

"ماڵئاواییت لێدەکەم بۆ دواجار"

هەریاد بەم نامەیە سەرسام بوو چونکە ئەوە لە بڕیاری شێتە نەدەچوو, شێتە شێتی ئەو بوو, چۆن دڵی هێنای ئەو نامەیە بنوسێت..؟! تەلیفۆنی بۆ کرد کە لە شوێنێك یەك ببینن و هەندێ قسە هەیە دەبێ بیکەن پێکەوە, شێتە

رازی بوو زۆریشی پێ خۆش بوو, بۆیە بەو پەڕی ئاسودەییەوە ووتی: "بەسەرچاو", کە یەکیان بینی هەریاد پێی ووت:
"شێتە.. من ئامادەم هەموو شتێك بکەم لە پێناو ئەو خۆشەویستیەی داوتە پێم, گەر لە کارو ژیانی من دەترسیت پێویست بەو ترسە ناکات, چونکە من خۆم دەزانم چی دەکەم, ئەگەر بڕیاری خۆتیشە وازم لێبهێنیت تۆ ئازادی, منیش کارەکەم بە جێ دەهێڵم", شێتە وەڵامی دایەوە کە نەخێر بێ گومان بڕیاری ناخی ئەو نیەو بەڵام لە پێناو ئاسودەیی ئەودا ئەم نامەی بۆ نوسیوە, دڵی یەکیان ئاشت کردەوەو پەیمانیان دا بە یەکدی کە هیچ شتێك نەبێتە ڕێگری ئەوانو ئەو عیشقە سەر شێتانەی ئەوان مومارەسەی دەکەن, بەڵام هەر وازیان لە شێتە نەدەهێنا ,چونکە شێتە کەسێکی کەم نەبوو کچێکی ژیرو جوانو قەڵەم بەدەست بوو، بۆ ئەوەی خۆیانی لێ نزیك بکەنەوە قەڵەمەکەی پێ بفرۆشنەوە، هەزار پلانیان دادەناو درۆی زەردو سوریان بۆ دەکرد, نەك تەنها پیاوەکان بگرە هەندێك کچو ژنیش هەبوون وازیان لە هەریاد نەدەهێنا , بۆ ئەوەی هەڵیبخەڵەتێننو غەریزەکانی بەیان بکەن، دەیانویست بچوکترین خاڵی لێ بگرن، هەر ڕۆژی کچێك خۆی بە ملیدا شۆڕ دەکردەوەو بە فرمێسکی تیمساحی سۆزی خۆیان بۆ دەردەبڕی، هەریاد هەموو ئەمانەی بۆ شێتە دەگێڕایەوە بەڵام شێتە زۆر توڕە دەبوو پێی دەووت خەتا لە خۆتە وەڵامیان مەدەرەوە، بەڵام دواتر هەریاد ئەو زمانەی نەبوو بتوانێ ڕەتی هەموو کەسێك بکاتەوەو دڵیان بشکێنێ چونکە لەتەمەنی هەرزەکاریدا توشی حاڵەتێکی زۆر غەمناك هاتبوو.
پێیم ووت توشی چی..؟
ووتی:
هەریاد بۆ ماوەی نۆ ساڵ کچێکی خۆشویست بەڵام خۆشەویستی نەبوو هەریاد ڕۆحی خۆی پێ بەخشیبوو شەوو ڕۆژی لەسەر یەك دادەنا لە پێناوی، دوای نۆ ساڵ تەمەن کچەکە تارای بوکێنی دایە سەرخۆیو ئەڵقەی بوکێنی بەدەستی برادەرێکی هەریاد خستە پەنجەی بۆ هەندەرانیش چوو، بۆیە شێتە هەرچی دەکردو دەیخواست بتوانێ ئەو ئەوینەی لەبیر بباتەوە کە کچەکە تەنها هەریادی بەجەستە هێشتبووە ڕۆحی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، شێتە هەموو ئەم چیرۆکانەی دەزانیو هێندەی دی هەریادی خۆشدەویست بەڵام دواتر ئەو حاڵەتەی شێتە پەرەی پێ دراو دڵی لە هەریاد پیس کرد

هەریادیش کە بەم مەسەلەی زانی دڵگران بوو شێتەی بانگکردوو قسەی لەگەڵدا کرد پێی ووت:
. چیتە..؟
. هیچ
. پێت دەڵێم چیتە..؟ رامەکە لە پرسیارەکەم هەموو جار بە "هیچ" وەڵامم دەدەیتەوە
. بێ تاقەتم
. بۆ بێ تاقەتی..؟
. بۆ خۆشی
. دەزانم بۆ خۆت تورە کردووە بەڵام تۆ تاکەی فێرنابی..؟ من لە داخی تۆ دەڕۆمو ئیدی بە هیچ شێوەیەکیش هەواڵم نەپرسی، تەواو بووم من بەرگەی خەمی دی ناگرم تێر بووم لەژیان تێر بووم لە هەموو شتێك، بەسمە نەهامەتی بەسمە گەمژەیی نەفرەتم دا لە عیشقو خۆشەویستی دەڕۆمو ملی خۆم دەشکێنم ئیدی بە هیچ شێوەیەك لێت ناپرسم چیم داوە لەم سەر ئەرزە دەچمە ئاسمان دەچمە پشت ئەستێرەکان بە گەمەکانی منداڵیم دووبارە خۆم دەژیێنمەوە دوور لە هەموو کەسێك".
بەڵام شێتە هەستی کرد کە خۆی لەدەست داوەو بەر لەوەی هەریادیش لەدەست بدات پێی ووت:

" گیانەکەم بمبەخشە.. رەنگە ئەمە دوایین جار بێ بێمە لات چونکە هەست دەکەم نەخۆشم خۆشەویستی توشی خەمۆکی کردوم، توشی گومانی کردووم، بومەتە مرۆیەکی گوماناوی، گومان لە هەموو شتێك دەکەم گومان لە سێبەرەکەیشت دەکەم کە بە تەنیشتەوە رێدەکات، گومان لە هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە لەگەڵتدا دەدوێن، نیگا نەرمەکانم تیژ بوونەو خەریکە کوێرم دەکەن، زمانم ناتوانێ وەك جاران ووشەی پڕ لە هەستو سۆزو ئەوین دەربڕن جگە لە ( بۆوات کرد، بۆ وا هاتی، بۆ رۆیشتی لەگەڵ کێ بووی، بۆ قسەت لەگەڵ فلان کردو چیت پێ ووتو ئەو چی ووت..؟) گومانەکان خەریکە شێتم دەکەن، خۆمم لێ ون بووە، دەچمە بەرامبەر ئاوێنەکەش شەڕ لەگەڵ خۆمدا دەکەم، تۆش بەرگەی ئەم نەخۆشیەی من ناگری، نازانی کە لە خۆشەویستیمە بۆ تۆ.. رقم لە هەموو ئەو کچانە دەبێتەوە لەبەرامبەر تۆ دێنو دەچن، لە هەموو وتنەکان تورە دەبم ناوی تۆ بێنن، بۆیە بڕیارە دور بکەومەوە بەر لەوەی رقت لێم ببێتەوە، بەر لەوەی لە ژورەکەت دەرم بکەیتە دەرەوە، بەر لەوەی حاشا لە ناسینم بکەیتو پێم بڵێی تۆ نیت ئەو کەسەی من دەیناسم، هەر چەندە زۆر ئەستەمە بڕیارەکەم.. بەڵام

دەبێ هەوڵ بدەم کە لە بیری خۆمت ببمەوە، بمبەخشە کە وشەکانم وەك گەڵای پایز هەڵوەرین، نیگاکانم بوون بە شوشەو لە بەرامبەر سیمات کەوتنە سەر زەوی‌و وردو خاش بوون، تازە ئەستەمە کۆکردنەوەیان، بمبەخشە.. بمبەخشە هەڵە بووم، نەدەبوو تۆ لە خۆم عاجز کەم نەدەبوو بە هەڵە لێت تێبگەم، نەدەبوو بە وشە ناشرینەکانم هەستت بریندار بکەم.. بمبەخشە هیچ مەبەستێکم نەبوو بەڵام ئەوە خۆشەویستی بوو کردمی بە رق، تەنها تۆم مابوو لەگەڵی بدوێم هەر تۆم هەبوو بێمە لای‌و باسی خۆمی بۆ بکەم هەر تۆ بووی سۆزت لەتەکمدا دەگۆڕیەوە، تۆ بووی هەموو کەسی من، تۆ بووی خۆشەویستی من، تا هەناسەش بە سیەکانمدا بێن‌و بچن تا رۆح ئاوێتەی جەستەم بێ هەر خۆشەویستی منی‌و خۆشم دەوێی، بەڵام بڕیارە دەبێ دور بگرم بۆ ئەوەی قەدەر بچوکم نەکاتەوە بەرامبەرت چونکە بەرگەی بچوککردنەوەی خۆم ناگرم گیانەکەم, دواتر بیرت نەچێ تۆ بەختەوەری بەختەوەر بەسیە گلەیی لەقەدەر, تۆ تێری لە هەموو شتێك‌و لە ژیان, ئەوەتانێ بەدووی ئارامی دەگەڕێی کە لە خەونەکانتدا لەپشت ئەستێرەکانەوە چاوەڕێت دەکا، بەختەوەری کە توانیت واز لە گەمەی عیشق بهێنی‌و قومار لەگەڵ خۆشەویستیدا نەکەی نەبادا خۆت بدۆڕێنی، بەختەوەری کە ئێستا بەم تەمەنەت دەگەڕێیتەوە لای وانەکان‌و خەونەکانی منداڵیت، بەختەوەری گەر لەهەر شوێنێك نیشتەجێ بیت دەبیتە خەڵکی ئەو شوێنە هەنگاو بۆ هەر رێگایەك بنێی دەتگرێتە خۆ، من چی بکەم زەمەنێکە بەدووی بەختەوەری دەگەڕێم‌و نایدۆزمەوە، تا ئێستاش نازانم گەنجینەکەم چیەو کەوتووەتە کوێوە, دەست لە چ بونەوەرێك پان بکەمەوە گەر رۆحم هێندە برسی بێ بۆ تیکەیەك ئاسودەیی، من بە خەیاڵیش دەستم ناگا بە ئەستێرەکان، ئێستاش ئارەزووی گەمەیەکی دیکەو دۆڕاندنێکی دیکە دەکەم لەگەڵ تۆو عیشق، من تا ئەمڕۆش لە منداڵیمدا بەجێماوم‌و قەراریاندا پیرم بکەن، ناتوانم لە هەموو شوێنێك نیشتەجێ بم نەبادا زیندە بەچاڵم بکەن، ناوێرم هەنگاو بۆ هیچ رێگایەك هەڵێنم نەبادا بەهاکان‌و جوانیم لێ بڕفێنن، جورئەت ناکەم هەموو قسەیەك بکەم نەبادا زمانم لێ زەوت بکەن، تۆ بڕیاری مەرگت دا بەسەر رۆحی پەشۆکاوم، خۆتم لێ مەکە جگە لە تۆ کەسی دیکە شك نابەم ئاسودەم بکات، کەس شك نابەم لە پرمەی گریانمدا خەندە بخاتە سەر لێوم، بێ تۆ

مەلێکی باڵ شکاوم دوا بڕیارت نائومێدم دەکات, هەروەك ئێستا نائومێدی دەرگای ئاسمانی لێ داخستمو ناهێڵێ جارێکی دی بە ئاسمانی حەزم بفڕم مەگەر لە کەناری خەمێك سەر داگرمو فرمێسك بڕێژم"

بەردەوام بوو لە قسە کردن هەریاد سەری داگرتبوو گوێی لێ دەگرت هەستی کرد شێتە بردی بۆ جیهانێکی دیکەو شیعری بۆ دەخوێنێتەوە، بەڵام شێتە نە چیرۆکی باس دەکردو نە شیعری دەخوێندەوە بەڵکو لە ناخی دڵیەوە ئەم قسانەی بۆ دەکرد، هەریاد لێی پرسی:

"منیش قسەم هەیە تۆ قسەت تەواو کرد..؟" شێتە ووتی:

ڕێم لێ مەگرە خۆشمبوێی ڕێم لێ مەگرە بتبینم, با تێر تەماشات بکەم بەر لەوەی بەجێتبهێڵم یان تۆ بەجێم بهێڵی، ڕێگەم بدە بۆ جارێکی دی بە دەنگی بەرز دەنگێك هەموو جیهان بهەژێنێ پێت بڵێم قەسەم بە خوا بە جوانی بە عیشق خۆشم دەوێی خۆشم دەوێی بمبورە گەر تەنها وشەی "هیچ"م لێ دەبیستی چونکە هیچێکم لە هیچەوە دروست بوومەو بە هیچیش کۆتایی بە بوونم دێتو ناگەم بە هیچ".

هەریاد بەخشیو ئارەزووی دوورکردنەوەی نەکرد, چونکە دواتر هەریادیش پێویستی بە شێتە بوو, کەسیان بێ یەکدی هەڵیان نەدەکرد.

. بە مەرجێ لە گومانەکانت دەبورم.

. چیە بڵێ گەر داوای ڕۆحم بکەیت دەیبەخشم..

. چاوەکانت داخە

شێتە هەردوو چاوەکانی داخستو هەریاد ماچێکی قوڵی ناو دەمی کرد پێی ووت:

شێتە خۆشم دەوێی.. هێندە خۆتیش تاوانبار مەکە, تۆ گوناهێکت نەکردووە، ئەوە منم ناتوانم تێتبگەیەنم.. دواتر وامەزانە تۆش بەختەوەر نیت, دڵنیابە تۆ بەختەوەرترین کچی, چونکە جگە لە تۆ دڵم بە هیچ کچێکی دی نەداوە، لەدوای (پەری) تۆ منت داگیر کرد، تا ڕادەیەکی زۆریش (پەری)ت بیر بردوومەتەوە کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی ئەو کارە بکات.

ئیدی شێتە هەموو دونیای بیرچووەوەو مەستی ماچەکەی هەریاد بوو.

ووتی:

نەك تەنها شێتە بگرە هەردیادیش حەزی دەکرد نامۆ بناسێ چونکە نامۆ دوو ڕۆح بوو لە جەستەیەکدا

دیوێکی دیار بوو, بەڵام دیوەکەی دیکەی شاراوە بوو، کەس نەیدەناسی، هەر دیوەکەی دیکەشی بوو ئەفسونی لە جیهان دەکرد، کەس نەیدەزانی حەقیقەتی ئەو کچە چۆنە تەنانەت نامۆ خۆیشی خۆی نەدەناسی ..!

بێ دەنگو تەنیا بوو، نە ئەو لەکەس دەچوو نە کەسیش لەو دەچوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو (ئەو) بەرامبەر بە منو ئاوێنەکە دەیپرسی:

"ئاخۆ خودایە دەکرێ تەنیایی چ ملۆزمێك بێ لە ملی نامۆ ئالآبێ، نازانم قەدەرە یان رێکەوت یا هەر شتێکە کە ناودەنرێ کچە کوردێکی ئەم دەڤەرە راپێچ دەکاو بەرەو قولآیی مەنگی دەبا، ئەمەیان نهێنیەکە تەنها نامۆ خۆی دەیزانێ".

مۆبایلەکەیەم گرت بەدەستمەوەو یەکە یەکە زەنگەکانیم تاقی کردەوە, لە دەستی وەرگرتم و وتی یاری پێ مەکە چاوەڕوانی تەلیفۆنێك دەکەم.

ووتم:

خۆزگە دەمزانی چاوەڕێی کێ دەکەی..؟ ئەرێ نامۆ هیچ نامەی دیکەی لە رۆژنامەدا بلآو کردەوە، شێتە هیچ نامەی دیکەی خوێندەوە هی نامۆ بێت..؟ ووتی:

بەڵێ بەڵام ئەمجارەیان نیو نامە، نامەیەکی ناتەواو..

کە پرسیم چۆن.. ووتی:

شێتە هەر کە زانی کاتی دەرچوونی رۆژنامەکەیە.. سەردانێکی خولیای کرد, بەڵکو وەك جاری پێشوو ژمارەیەکیان بۆ دانابێ، بەڵام نەگەیشتبوو، چوو هەموو کتێبخانەو نوسینگەکان گەڕا تەنانەت ژمارەیەکیشی لێ نەمابووەوە کە پرسیاری بۆ نەمانی کرد ووتیان:

کچێك هاتووە هەموو ژمارەکانی کڕیوەتەوە، شێتە زۆر بێ تاقەتو سەرسام بوو بەوەی ئەو کچە کێ بووەو بۆچی هەموو ژمارەکانی لە بازاڕدا نەهێشتووە..! هەزاران پرسیاری سەیری لەلا دروست بوو:

رەنگە ئەو کچە نامۆ خۆی بوبێت هاتووە هەموو رۆژنامەکانی بردووەتەوە بەڵام بۆچی..؟ تۆ بڵێی کامۆ وەڵامی نامەکانی دابێتەوە بۆیە ئەویش حەزی کردووە هێندەی دەرچووی ژمارەکانی رۆژنامەکە نامەی خۆشەویستەکەی بخوێنێتەوە..؟! نا لەوانەیە لە کامۆ زویر بوبێتو نامەیەکی دڵتەزێنی نوسیبێو بلآوی کردبێتەوە دواتر پەشیمان بووەتەوە, بۆیە بە خێرایی هەمووی بردووتەوە نەبادا بەرچاوی کامۆ بکەوێ، نەوەڵڵا دەزانم خەڵکی قسەیان پێ کردووەو ئاشکرایان کردووە کە ئەویندارى ئەو کوڕەیە بۆیە لە داخاندا هەمووی

بردووەتەوە ماڵیٚو سوتاندویەتی، نا رەنگە بۆی دەرکەوتبیٚ کە کامۆ ئەو رۆژنامەیە ناخوێنێتەوە وای بەباش زانیوە هەمووی بۆ بەرێتەماڵەوە".
ووتم:
من لەگەڵ بیروبۆچی دوا دانەیانم، نامۆ خۆی بووەو بردویەتیەوە ماڵی کامۆ، بەڵام ماڵی لە کویٚ بوو..؟
ووتی:
باشت زانی, بردبویەوە ماڵی بەڵام دەبیٚ بزانی سەرشەقامەکان ماڵی کامۆ بوو.
بە سەرسوڕماویەوە لە دڵی خۆمدا ووتم دیارە بردویەتیە سەر شەقام، لە پڕ قیڕاندمە سەری بەڵام کام شەقام..؟
ووتی:
نامۆ وەك سەرگەردانێك هەموو ژمارەکانی کڕیبووەوەو لەهەموو کوچەو کۆڵانەکانی شارو دابووی بەدەستی هەموو شەقامەکان, بەڵکو کامۆ هەڵیبگرێتەوەو چاوێکی پیا بخشێنیٚ، ئایە گەر شتێکی تیا نەبیٚ بۆ لەناو شەقامەکان بڵاو دەکرێتەوە؟ بەڵام ئەفسوس فریا نەکەوت..! کاتیٚ نامۆ رۆژنامەکانی بە هەموو شوێنێکدا بڵاوکردەوە کامۆ لەشار نەمابوو، بۆ هەندەران کۆچی کردبوو دوای ئەندێشە کەوتبوو، نە شنەبایەك نەڕەشەبایەك هەڵیکرد تا ژمارەیەك بگەیەنەتە دەستی، نامۆ کە بەمەی زانی پەرێشان بوو هەستی کرد چرکەی کاتژمێری تەمەنی وەستاوەو رۆژی حەشرە.. ئەو رۆژەیە کە هەموو کەس هاوار دەکات"نەفسی.. نەفسی" بەڵام نامۆ تەنها هاواری لە خۆی نەدەکرد، هاواری لەو کوڕە دەکرد کە بڕیاری رۆیشتنی دابوو بەبیٚ خوداحافیزی لە نامۆ، کامۆ سەفەری کردبوو بەڵام درەنگانیٚ شێتە ئەوەی زانی، پێشتر نامۆ دەیزانی کە کامۆ بە نیازی سەفەرەو نیەتی لیٚ هێناوە هەر رۆژێك بۆی رێبکەویٚ دەڕوات، بۆیە چەند نامەیەکی لەسەر یەك بۆ نوسیبوو لەهەموو نامەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە دڵگرانە بەوەی خۆشەویستەکەی کۆچ دەکات، بەڵام پێدەچێت، کامۆ بۆ چرکەیەکیش رێزی لە هەستی ئەو نەگرتبیٚو رەتی هەموو نامەو خۆشەویستیەکەی نامۆی کردبێتەوە.

هەر لەخۆمەوە خەریك بوو رقم لە کامۆ هەڵدەستا, حەزم کرد بزانم ئەو نامانەی نوسیبووی بۆی چی تیا بوو چی ووتبوو..؟ چۆن پێی ووتبوو دڵگرانم بە کۆچت..؟ سەرم لە ئاوێنەکە هێنایە دەرەوەو یەخەی کراسەکەیم گرتو تکام لیٚ کرد هەموو نامەکانی نامۆم بۆ بخوێنێتەوە، بیٚ

ئەوەی خۆی بشێوێنێ دەستی درێژکرد بۆ دۆلابەکەی و جانتای شانیەکەی دەرهێنایەوەو چەند نامەیەکی تیا دەرکرد، نامەکان رۆخساری نامۆیان پێوە دیار بوو، بۆنی نامۆیان لێ دەهات، بەلام نەمزانی چۆن گەیشتبووە دەستی (ئەو)..!, ئێستا بۆم دەرکەوت نامەکەی یەکەمیش کە وامزانی هی خۆیەتی هی نامۆ بوو خوێندیەوە, خۆ پێشتریش پێی ووتم کە کۆپی نامەکانی لەلایە, حەزم دەکرد ئەویش بزانم, بەلام بەر لەوە دەمویست گوێم لە نامەکان بێت، یەك لە دوای یەك نامەکانی بۆ خوێندمەوە:

"دڵی من..
نزیکەی دوو ساڵە تەنها شتێك کە غەمبارو دڵگرانی کردبم کۆچی تۆ بووەو کۆچی تۆیە, کەچی ئەو کۆچەش دڵدانەوەی تۆیە, منیش کێم هەیە جگە لە تۆ بۆی بژیم و شیعری بۆ بنوسم و بۆی بگریم و وەك منداڵیش بە پسە پسەیەك بۆی پێبکەنم و بکەومەوە گروگاڵ..؟
هەرگیز ناخۆشی و نا ئاسودەیی تۆم ناوێ, پێ بە دڵی خۆمدا دەنێم و دەیکەمە قوربانی ویست و داخوازیەکانت, بۆیە دەڵێم برۆ ئازیزی من برۆ, تا قاچەکانت ماندووی رۆیشتن دەبن, برۆو بزانە پێلاوەکانت تا کوێ دەڕۆن و بۆ کوێت دەبەن, برۆو رۆحی منیش ببە لەگەڵ خۆت, تا ببێتە سایەو سێبەرت, من جگە لە خۆشیت هیچ شتێکم ناوێ لەم جیهانەدا, برۆ گەر دەزانی و زانیت ئارامی و خۆشەویستی و هەناسەدان بە ئازادی لەوێدا دەدۆزیەوە مەیەرەوە بۆ گلەیی لە ژیانی ئێرە, گەر یادی منیشت کرد, لە پەلکی شۆرەبیەك دەمدۆزیەوە, لە ناخی تاریکییەك دەمبینی وەك ئەستێرە بۆت دەدرەوشێمەوە, لە قولایی بێدەنگیەك گوێت لە دەنگم دەبێ, بە ئاوڕدانەوەیەك لە یادوەریەکان بە تەنیشتەوە دانیشتوم, هەر کاتێکیش بێزار بووی لەسەفەر بگەڕێوە, رۆحم دەکەمە فەرشێك و لە ژێر پێتدا رایدەخەم, باوەشت بۆ دەکەمەوەو ماچت دەکەم, بە گوڵ پێشوازیت لێ دەکەم, بە هاتنەوەت ئارەزووی هەڵفڕین دەکەم.
خۆشەویستەکەم بمبەخشە, دەبوو ئەم قسانە بەرەو روو بە دەم پێتی بڵێم, بەلام بڕوا بکە لە ئاستتدا هیچم بۆ ناوترێ, لە بیستن و ووتنی وشەی کۆچیش وەك منداڵ دەست دەکەمە گریەو دەترسم بێ تاقەتت بکەم, هەر بۆیە پەنام بردە بەر نوسین و دەربڕینی ئەم پەیڤانە, ئەمێستا کات دوو نیوی شەوە, خوێنم بووە بە مەرەکەب و دڵم

هاتووەتــە ســەر دەســتم‌و ڕۆحــم لــە نــوکی قەڵەمەکــەم وەستاوەو ئەم دڵۆپە فرمێسکانە دەنوسمەوە.
کەسـی مـن.. تـۆم هـەبێ‌و بەتـەك تـۆوە دانیشـم, وادەزانم خودا کەسی خەلق نەکردووە جگە لە تۆ تەنانەت داکیشم بیر دەچێتەوە کە نۆ مانگ‌و نۆ ڕۆژ بە پشتی هەڵیگرتووم.
بمبەخشە گەر دەڵێم بۆ من خودا یەکێك‌و کامۆ یەکێك
هەر وەك ڕوئیا بە بەهمەنی گوت, بەڵام
لەوەتەی بانگی سەفەرت داوە
لە تەقسی حوجرەی خەڵوەتدا
نوێژەکانم دابەستنیان بیر چووەوە
کامەرانیم جادویەکی ژیان بوو
قەدەر بەتاڵی کردەوە
حەزەکانم
بەدەستی قبلەنمای کۆچەکانتەوە
هەنگاوەکانیان شکا
پێکەنینم هەنسکێ ئیغتیسابی کردو..
خەندەم کچێنی خۆی لەدەستدا.
ئیدی ئەوە قەدەری منەو دەبێ رازی بم بەو قەدەرە لە پێناو ئاسودەییت بەقوربان.

قوربانی تۆ بێت

نامۆ "

لەپاش خوێندنەوەی ئەو نامەیە نامەیەکی دیکەیشی بۆ خوێندمەوە بەڵام لەم نامەیەدا ئاماژە بە تورەبوونی کامۆ دەکات, لە هەمان نوسینداو لە کەنار وشەکانی دیکەیدا هەمدیسان ئاماژە بەو سەفەرە دەکات کە کامۆ چپاندویەتی بە گوێیداو بێ تاقەتی کردووە بەو بڕیارە، لەم نامەیەیدا دەڵێت:

"پاش ڕێزو سڵاو..

دڵی من.. پێت سەیر نەبێ ئەم نوسینەم, گەر بمەوێ بەقەڵەم لەگەڵتا بدویم‌و هەندێ ڕاستیت بۆ روون بکەمەوە, ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە من‌و تۆ تا ئێستا نەمانتوانیوە تەواو لەیەك بگەین, چونکە دەرفەتی قسەکردنمان نەبووە تەنها بە مۆبایل نەبێ ئەوەیش کاتێ دەگەینە ئەوەی شتێك بگەیەنین بەیەك یان من سانتم نامێنێ یان تۆ, ئەگەر بمانەوێ تاوێکیش پێکەوە دانیشین هەموو عالەم لێمان دێنە ژورەوەو قسەمان لێدەبڕن, بۆیە ناچار پەنام بردە بەر نوسینی چەند ڕاستیەك‌و یاخیبونێك, بۆ ئەوەی هیچ گومانێکت لەسەرم نەمێنێ, بەر لە هەموو وتەیەك خۆشمدەوێیت, ڕەنگە خۆت باش ئەوە بزانیت, قەسەم بەو خودایەی

خەلقمانی کردووە تۆ یەکەم کەسی وا لەمن بکەیت هەست بە بوونی خۆم بکەم، بەر لە ناسینی تۆ من پەیکەرێکی بێ گیان بووم‌و هیچی دی، بەلاّم لەوەتەی تۆم ناسیوە دەگریم، پێدەکەنم، بیردەکەمەوە، دەناڵم، نەخۆشدەکەوم، چاك دەبمەوە، دەخۆم، مان دەگرم، تورە دەبم، هێمن دەبمەوە، دەخەوم‌و خەون دەبینم، کەواتە تۆی من دروست دەکەیت، بێ تۆ مەحاڵە بوونی من، مەڵێ وامەبەو مەشڵێ خراپ بیردەکەیتەوەو من شایەنی ئەو خۆشەویستیە نیم.. نا دڵەکەم.. تۆ شایەنی زیاتری لەبەر ئەوەی گەورەی زۆر گەورەتری لەوەی من بیری لێدەکەمەوە، منیش بە تۆوە گەورەیی خۆم دەبینم، دوێنێکەش کە قسەم بۆ کردی‌و تۆ تورە بوویت‌و وتت "مادام دەزانی بە ناسینی من‌و رازی کردنی دڵی من لەخۆت دادەگری پێویست ناکا قوربانی بدەی، بۆ من لەخۆت کەم مەکەرەوە" مەبەستم ئەوە نەبوو کە لەوەتەی تۆم ناسیوە هەست بە بچوککردنەوەی خۆم دەکەم، بەڵکو مەبەستم بوو تۆ کاتێ کە وەلاّمم نادەیتەوە، وا هەست دەکەم بێزارم کردووی، مرۆڤیش گەر گەیشتە ئەو رادەی مرۆیەکی دی بێزار بکات بچوك دەبێتەوە لەبەر چاوی هەموو کەسێك تەنانەت خوداش، ئەگەریش ناتوانم دەستبەردارت بم لەبەر ئەوەیە کەسێکی دی نادۆزمەوە لە تۆ بکات، من لە دوای خودا تۆ دەپەرستم، پەرستن بە هەموو مانایەك ئەوەش مانای بچوککردنەوەی من نیە، بەڵکو گەورەییە بۆ من رۆحێك بپەرستم کە رۆحی من عاشقی بێت، رەنگە چاوەڕوانی دەربڕینی ناخم بکەیت منیش جورئەتی ئەوەم نەبێ قسەت بۆ بکەم‌و بڵێم چەند ئەویندارتم، بەلاّم شەرمت لێ دەکەم، شەرم بەو مانایەی رێزت دەگرم تا ئەو رادەی نەتوانم هەموو شتێکت لە لا باس بکەم، کاتێکیش لە نێوەندی شەرم‌و رێزو سوتاندا دیل دەبم گەرووم پڕ دەبێ لە گریە تۆش پێی بێ تاقەت دەبی، گیانەکەم مەڵی مەگری، چونکە کاتێ کە دەگریم هەزاران وشە لەگەڵ دڵۆپە فرمێسکێك دێنە گۆ، ئەفسوس نایانخوێنیتەوە، هەمووشی لە پێناو خۆشەویستی تۆیە، رەنگە بیرت بێت یەکەم جار کە ویستم ناخمت بۆ دەربڕم دوو وشەم ووت، تۆش ووتت: "بۆ پێم دەڵێی رقم لێتە..؟" دەستم کردە گریان‌و ووتم لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێی بەلاّم هێندە گەورەو بەرێزی لە دڵم نەمزانی چۆنت پێ بڵێم کە خۆشمدەوێی.

دڵی من.. خۆشەویستیت وای لێکردم ئیرەیی بەو سێبەرەش ببەم کە سێبەری خۆتەو بەتەنیشتەوە

راوەستاوە, بەڵام بەلامەوە زوڵم بوو قسە بکەم‌و بڵێم نابێ بەتەك سێبەری خۆتەوە بوەستی.

زۆر جار تورەم دەکەیت‌و دەڵێی: "بیر لە کەسێکی دی بکەوە" هەڵەی گیانەکەم چونکە شتی وا ناکرێ‌و نابێ, کەس ناتوانێ دڵی من رابگرێ تۆ نەبی, کەس ناتوانێ لەمن تێبگات تۆ نەبی, کەس ناتوانێ نیگاو جوڵەم بخوێنێتەوە تۆ نەبی, کەس ناتوانێ فێری خەون بینینی جوانم بکات تۆ نەبی, کەس ناتوانێ شیعرێك نامەیەك بەمن بنوسێ تۆ نەبی, کەس ناتوانێ بە رۆحی تەحەکوم بە عەقڵم بکات تۆ نەبی, کەس ناتوانێ بمگرێینێ‌و لە هەمان کات گریانم لە بیر بباتەوە تۆ نەبی, کەس ناتوانێ هەست‌و نەستم بکاتە کار گەر تۆ نەبی, کەس ناتوانێ وانەی عیشقم پێ بڵێتەوە گەر تۆ نەبی, عەشقی سروشت, عەشقی خودا, عەشقی ژیان, عەشقی مردن, خودا کوێرم بکات‌و دونیام لەبەرچاو تاریك بکات گەر لە تۆ زیاتر ئەویندارى کەسێکی دی بم, پەیمانیشم داوە بە خودا یان تۆ یان مردن, مردن نەك بە شێوەی خۆکوشتن, مردن بەو شێوەی کە ئیدی بیر لە بە هاوسەربوون ناکەمەوە لەگەڵ کەسێك کە نەتوانم بیری لێ بکەمەوە, تەنیایی دەگرمە باوەش تا مەرگ دەمباتەوە, خۆم سوێند داوە یان تۆ یان مردن, درۆیش ناکەم لە ژیانمدا نە درۆم کردووەو نە فشەکەریش بوومە گەر وا بیرم لێ بکەیتەوە, راستگۆیی پیشەی هەناوو رۆحم بووە لەوەتەی هەم, داوای لێبوردنیش دەکەم گەر هەندێ جار نا زۆر جار لە خۆڕایی گومانم لێکردبی‌و قسەی بەلاشم کردبێ دەرحەق بەتۆ, بەڵام بڕوا بکە مەبەست تورەبوونت نەبووە بمبورە, بەڵکو ویستومە ئەو شتانەی لێی تێناگەم تێمبگەیەنی, لەبەر ئەوەی شێت دەبم کاتێ دەبیستم کەسێك بێ ئەوەی بتناسێ باست دەکات, بێ ئەوەی نازی تۆ هەڵبگرێ ناز بەسەرتا دەکات, بێ ئەوەی گوێی لە قەسەیەکت بێ حوکم بەسەرتدا دەدات.

گیانەکەم دڵی من.. لێم تورە مەبە من هیچ کات نەمویستووە نازو مەکرت بەسەردا بکەم چونکە ئەویندارتم, حەقمە لێت بترسم, حەزمە لێت بپرسم, هەر کاتێك ببینم ماندوو بێ تاقەتی هەست بە مردنی خۆم دەکەم, کە دەپرسم چیتە, بۆ بێ تاقەتی, بۆ ماندووی, چی بووە, بۆ ناپرسی, بۆ وەڵامت نیە, بۆ تورەبوویتە, بۆ پێدەکەنی..؟ بە وشەی "هیچ" وەڵامم دەدەیتەوە ئیدی لە بیستنی ئەو وشەیە من دەبمە بەشێك لە نەمان‌و دەبمەوە بە هیچ, بۆیە دەڵێم"لە نەزانیندا هەموو شتێکم" چونکە

هیچ نازانم، ناشزانم "هیچ" چیەو بۆ ئەو وشەیە هێندە بە کار دێتەوە لای تۆ..! هەرچیەك بێت ئارەزووم بووە پێم بڵێی تا لێت تێبگەمو چارەسەری کێشەکانت بکەم گەر خۆم لەسەر دانابێ، بەڵام تۆ گەر کێشەیەکت هەبێ حەز ناکەیت قسەشت لەگەڵدا بکەم، بۆیە گریاومو پەنا دەبەمە بەر گریان، تا دەردە دڵم دەردەکەم.

دڵی من کاتێ کە ئەم باسانە لێرە دەکەم مەبەستم ئەوەنیە بڵێم خەتاتەو هەر تۆ تاوانباری بەڵکو مەبەستم راستی دەرونمە، کە چەند جارێك پرسیارم کردووە وەڵامەکەی لای تۆ وون بووە، ناشمەوێ وەڵامی پرسیارەکانم لە کەسێکی دی وەربگرم، من رۆحم لەو شوێنەیە کە تۆ پێی پیا دەنێیت، خۆ بەدەستی من نیە خۆشم دەوێی، دڵنیاشت دەکەمەوە گەر جێمبهێڵێ‌و بڕۆی، دەڕۆمو وون دەبم لەبەرچاو، مەگەر تەنها خودا شوێنم بزانێ، لە غەریبستان دەبمە وەلی دێوانە تا دەتدۆزمەوە، چونکە ژیانم بێ تۆ هیچ بەهایەکی نیە، دەستبەرداری هەموو دونیا دەبم بەڵام تۆ نا، چەند جارێك خۆم تاقییکردووەتەوە وازت لێبێنم نەمتوانیوە، هێندەی دی بۆت سوتاوم، ئیدی پێم نالێی چی بکەم..؟ ئەوەی هاوڕێی تۆ بووە بوە بە هاوڕێی من، ئەوەی ناحەزی تۆ بووە بووە بە ناحەزی من، ئەوەی حەزی تۆ بووە بووە بە حەزی من، چ مرۆڤ بێت یان شتی دی، ئەو کەسەی بێزارت بکات بێزارم پێی، ئەو کەسەی باست بکات بە چاك یان خراپە، ئیرەییم بردووە، نازانم بۆ، بەڵام رۆژێك بۆت روون دەبێتەوە چەند راستگۆ بوومە لەگەڵت‌و پێت نەزانیوە، بەڵام ئاخ تەنها بیر لە کۆچ‌و تەنیایی‌و نامۆیی دەکەیتەوە، ئەگەر ئەوەش حەزو بیری تۆیە من ناتوانم رێگر بم، حەزناکەم حەزەکانت بشێوێنم، رەنگە ئەم سەفەرە لە دایك بوونەوەی تۆ بێت رەنگە هەموو ئازارو خەمەکانت بیر بچێتەوە بەڵام بیرت نەچێ بەر لەوەی بڕۆی بمکوژە، ئەگەر نا دێم لەگەڵت گەر بە رۆحیش بێت، گرنگ نیە بەلامەوە ببمە باسی هەموو باسێ، ببمە مانشێت‌و هەواڵی نێو هەموو رۆژنامەکان، ببمە بنێشتی ژێر دانی هەموو خەڵك، نەخێر ئەوانەم هیچ بەلاوە گرنگ نیە تۆ نەبێ، ئەگەر بەردیشم لێ بگری ناڵێم بۆ..؟ ئەگەر تفیش بکەیتە چارەم سەر هەڵنابڕم، لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێی.

"من پێم ووتی:

بەر لە هەڵکردنی گەردەلولێك لە بیابانی قەدەرم

شەماڵێك هاتنی تۆی پێم راگەیاند

بەر لە نیشتنەوە قەلەرەشێك

لەسەر درەختی تەمەنم
تیترواسکێك لە کەناڵە ئەزمونەکان
هەواڵی خۆشەویستی تۆی پەخش دەکرد
بەر لەوەستانی کاتژمێری تەمەنیش
تۆ هاتی
تۆش ئازیزم بەر لەوەی بێیت
عیشق هاتو تۆی پێ ناساندم
فەرشی بەر پێت
نامۆ"

من هەستم دەکرد نامەکانی هەموو لە دوای یەك نوسرابن, یان نازانم چی بڵێم, کچێك هێندە عاشق بێت, مەعشوقەکەی هێندە دڵرەق, بۆ وەڵامەکانی کامۆ دیار نیە, قەیدی چیە..؟ نەدەبوو لێرەدا نامەکانی ئەویش بخوێنرابانەوە..؟! نازانم من تەنها گوێ رادەگرم بزانم نامۆ چی دیکە دەڵێت لە نامەکانیدا کە بۆ کامۆیانی نوسیوەو هێندە بریندار بووە بە کۆچی, نامەوێ خەیاڵو قسەی زیاتر بکەم, وەرە لەگەڵم با گوێ لەم نامەیەش بگرین بزانین لێرەدا چی دەڵێت..

"خۆشەویستم..

ئەمڕۆ زۆر دڵتەنگ بووم, لە دوری تۆ هەناسەم ئاسایی نەدەهاتو نەدەچو, بیرو هۆشو هەموو هەستو نەستێکم دیلی تۆ بوون.

ئەزیزم.. ویستم نامەیەك بە ژمارەی مۆبایلەکەم بنێرم, بەڵام ئەو کانیاوەی لە دەمما دەتەقی لەو شتە بچکۆلانە جێی نەدەبووەوە, بۆیە ناچار ئەم لاپەڕە سپیە بێ گوناهانەم هێنا تا بە ئازارو مەینەتیو تاوانەکانی عیشق پڕیان بکەمەوە, رەنگە بپرسی عیشق تاوانە..؟ بەڵێ وەك خۆت دەڵێی لەم وڵاتەدا هەموو جوانیەك تاوانە..!

کەسی من, دڵدارەکەم.. پێت سەیر نەبێ نوسینی ئەم نامەیەشم خۆشم دەوێی, ئۆقرە ناگرم هیچ نەڵێم نەچمە قوڵایی سۆزەوە, هەرچەند بیر لە قسەکانیشت دەکەمەوە کە پێت ووتم: "لەبەر ئەوە خۆشم دەوێی حەز دەکەم بە قسەم بکەیت, هێندە قوڵ مەبەرەوە". ئازیزم دڵێك بە هاتنی تۆو دەنگی ترپەی پێت کەوتبێتە لێدانو بە رۆیشتنی تۆش لە لێدان بکەوێ چۆن دەتوانێ ئۆقرە بگرێو بە سۆز نەبێ..؟ مرۆڤێك کە پێی وابێ کەسێك هەیە وەك مرۆڤ رێزی لێ دەگرێو وەك مرۆڤ گوێی لێ دەگرێو وەك مرۆڤ تەماشای دەکات چۆن بڕیاری نامرۆڤ بوونی بدات..؟ هەناسەیەك لە سینەی تۆ وەرگیرابێو

چاوەڕوانی قومێك هەناسەی دی بكات لە ماچێكدا پێی ببەخشێ, چ حەشرێكە حاشای لێ بكا..؟.

نا ئەزیزم.. مەحاڵە ژیان بە بێ تۆ ئیدی چۆن بڕیار بدەم بێ تۆ بژیم..؟, رەنگە پێم بڵێی چیت دەوێ لەمن..! دەتەوێ بزانی چیم دەوێ لە تۆ..؟ دەمەوێ بەهارەی باخی پڕ لە گەڵای وەریوم بیت, دەمەوێ هەور بیت و بباری تێر ئاوم بكەیت, دەمەوێ رۆژ بیت و كۆتایی بە شەوی تەنیاییم بهێنیت, دەمەوێ روگەی ئارەزووم بیت, بوزای من بیت, هەموو شتێكی من بیت منیش هەموو شتێكی تۆ, رەنگە پێم بڵێی تۆ كێیت..؟ من رێبوارێكی ماندووی بە دوای ئەویندا گەڕاو, ئێمە هەردووك لەبەردەم كانیاوێكی رووندااین با تینوێتی بشكێنین ئەزیزم.

من ناتوانم خامۆشت بكەم یان فەرامۆشت بكەم, مەڵێ ناشرینم تۆ ناشرین نیت, وەرە لە ناخی مندا خۆت ببینە چەند جوانی, تۆ وەرزی خەزان نیت وەرە لە بەهاری مندا بڕوێ چەند سەوزی, تۆ نامۆ نیت وەرە لە تەنیشت مندا خۆت ببینە چەند ناسراوی, من ناشرینم من نامۆم من پایزم چونكە ئەوە منم و منیش مرۆڤم, تۆ ئەو پەڕەسێلكەی رۆژانی رەنگین و منیش ئەو شەوە هەستیارەی بێ ئومێدیم, تۆ ئەو كانیاوە روونەو من ئەو رێبوارە ماندووە تینووە لە بیرچووەم.

خۆشەویستم هەر كە باسی سەفەر دەكەی چاوم پڕ دەبێ لە ئەشك, هەموو شتێكم بیر دەچێتەوە, تەنها ئەوەی لەو چركەیەدا بیری لێدەكەمەوە تۆی كە بە جانتایەك لەحەسرەت و كۆڵێك خەم و هەناسەیەكی خنكاو, سواری شۆفیرێكی ترس دەبیت و مل بە رێگەیەكی سەراب دەنێی, تۆش دەتەوێ لەو كاتەدا قسە بكەم, چۆن دەتوانم قسە بكەم..؟ لە بێ دەنگی ئەو كاتەدا هەراسان مەبە, قەد بیستوتە كە باخێكی گەڵا وەریو بە بەهارێكی لە رێوە گەیشتوی باوەڕ نەكراو بێتە گۆو قسە بكات, نازانم چۆن ئەم هەموو نهێنیی و هاوارە لە چاوەكانمدا بەدی ناكەی.

نازانم.. نازانم.. نازانم

ئەم وشەیە بووەتە وەڵامی زۆر شتی من و تۆ, بووەتە حەشارگەیەك حەشارمان دەدات كاتێك لە وەڵامی پرسیارەكان رادەكەین, دەزانی شتێكی دیكەش نازانم ئەویش ئەوەیە كە نامەیەكم بۆ نوسیبووی لە رۆژێكی سەیر دامپێت, نازانم چیم تیا نوسیبوو رەنگە ئەم وشانەی لێرەدا نوسیومن دوبارە بن, ناشزانم چیت لێ كرد, دڕاندت, سوتاندت, نازانم, بەڵام گرنگە لە یادت

بێت, کێشه نیه چیت لێ کردبێ بەقوربان, بەر لەوەی ئەم نامەش بنوسم بڕیارم دابوو کە ئیدی نامەکان بڵاو بکەمەوە تا وەکو بابەتێکی رۆژنامەوانی بیانخوێنیتەوە, بەڵام لە پڕ پەشیمان بومەوە ترسام بە خوێندنەوەو بڵاوکردنەوە ئەو نامانە من‌و تۆ ببینە شەوچەرەی گەمژەکان‌و قسەو باسی ناحەزان تا بە زۆری عیشقمان لێ کاڵ بکەنەوە, بە پەلە بەڵێنم دا بە خۆم کە تەنها بۆ تۆ بژیم, ئەوەشی دەینوسم تەنها بیدەم بە خۆت بیخوێنیتەوە گەر دەرفەتت بوو.

ئەزیزم.. رەنگە ئەمە یەکەم نامەم بێت بۆ قسە کردن لەسەر خۆم‌و رەنگیشە دوا نامە بێت بۆ لەبیر چوونەوەی خۆم, رەنگە بگەمە بڕیارێك تا سەربەستت بکەم لە رۆیشتن چونکە پێدەچێ بە منەوە بەسترابیتەوە, دەبێ قوربانی بدەم بە رۆحم لە پێناو ئەو سەفەرەت, دەبێ رۆح‌و جەستەم بکەمە قوربانی رێگەت‌و لە چاوەڕوانیتدا شەهیدی عیشق بم, رەنگیشە ئەمرۆ یان سبەی من بڕۆم بەر لەوەی بەجێم بهێڵی, ئەو کاتە عیشق دەبێتە قوربانی‌و من شەهید دەبم.

ئەزیزم, خۆشەویستم, هەناسەکەم, بگە بڕیارێك یان من بگەیەنە بە بڕیارێك بەڵکو دڵنیابم.

**ئەو کەسی بۆت دەسوتێ**
**نامۆ"**

کاتێ (ئەو) ئەم بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕامەوەو ئەو نامانەی دەخوێندەوە فرمێسك بەسەر رومەتەکانی دەهاتنە خوارێ، مەرگم دەبینی لەناو چاوەکانیدا کە ببووە خوناوو بە قەدەریدا شۆڕ دەبووەوە، چیرۆکی وام لەهیچ شوێنێك نەبیستبوو، لە هیچ زەمەن‌و سەدەیەکدا ئەفسانەی وام نەخوێندبووەوە ژیانی نامۆو شێتە پڕ بوون لە کارەسات پڕ بوون لە حەسرەت پڕ بوون لە نائومێدی پڕ بوون لە گەڕان بەدوی راستی‌و بەختەوەری کە نەدەدۆزرانەوەو نەبوو، تەنانەت نەنکیشم کاتی خۆی بۆ ئەوەی هاروهاجی نەکەین دەیوت وەرن دانیشن چیرۆکتان بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام ئەم چیرۆکەی نامۆو شێتەی نەدەزانی، ئێستا من نازانم شێتەکانم خۆشبوێ تا بۆنی شێتەیان لێ بکەم‌و نامۆیان پێ بناسێنم, یان بچم شەقامەکان بگەڕێم تا ژمارەیەکم لەو رۆژنامەیە دەست بکەوێت‌و بە شوێن هەنگاوەکانی کامۆ بکەوم‌و بیگەیەنمە دەستی.. یان دانیشم وەك ئەو رۆژەی لە بێ تاقەتی (ئەو)و گێڕانەوەی چیرۆکەکانی (ئەو) دەچوون، منیش وا

بێتاقەت بم، ئێستا من چیرۆکی (ئەو)یش دەبێ ببەستمەوە بە شێتەو نامۆو بیگێڕمەوە بەو کەسەی دەیگەمێ .

ووتی:

کچێ شێتە.. لە کاتی گەڕانەوەیدا بەرەو ماڵەوە دوای هەموو ئەو کەسانە دەکەوت کە ڕۆژنامەیان بەدەستەوە بوو، ڕێکەوت پیاوێکی بینی بە ڕۆژنامە جامی ماشێنەکەی دەسڕییەوە دڵی خورپەی کرد وەك بڵێی مەرگی نامۆی دەبینی بە دەستی پیاوێکەوە بێ بەزەییانە بۆ بەرژەوەندی خۆیو سڕینەوەی ناشرینیەکانی خۆیو ماشێنەکەی.. ڕۆحی نامۆ دەکێشێ کە بە دێڕەکانەوە هەڵواسرابوون، هەنگاوێکی دەناو دوانی دەگەڕانەوە نەیدەزانی چی بکات گەر ئەوە ڕۆژنامەکە بێ توشی چ ڕوو بەڕوو بونەوەیەك دێت..؟ بەڵام شێتە دواتر ووتی:

"ئەو بەستەزمانە چی بکات چوزانێ ڕۆژنامە چیەو نامۆ کێیە..؟ ڕەنگە هەر وابزانێ هیچ سودێك لە خوێندنەوەی بابەتێك نابینێ بەقەدەر ئەوەی جامەکەی پێ پاك بکاتەوە، خۆ ڕەنگە هەر خوێندەواریش نەبێ، ڕۆژنامەشمان هێندە زۆر بوونە کەس تاقەتی خوێندنەوەیان نەماوە بەڵکو کات نەماوە بۆ خوێندنەوەیان".

کە چووە پیری بینی ڕۆژنامەکەیە خۆیەتی..! بە خێرایی لە دەستی پیاوەکەی هەڵپچڕکاندو تەماشای کرد دڕاوە، نامەیەکی تێدایە بەڵام چەند دێڕێکی تیا ماوەو ئەوەی دیکەی تەڕ بووەو فرێدراوە، پیاوەکە بەسەر سامیەوە تەماشای شێتەی کردو چەند بۆڵەو پرتەیەکی لێوە هات، بەڵام شێتە فرمێسك لە چاوەکانی قەتیس مان کە ئەو چەند دێڕەی دەخوێندەوە، نەیدەزانی پیاوە چی دەڵێتو ناڵێت, بە کوتە ڕۆژنامەیەکەوە سەبر سەبر هەنگاوی دەناو نەیدەتوانی ڕێبکات هەستی دەکرد هەموو دونیا هاتووەتە کۆڵی.

پێیم ووت:

لە نامەکەدا چی نوسرابوو، ئەو چەند دێڕە چی دەووت..؟

ووتی: نوسیبووی:

"خۆشەویستم..

دەمێکە دەزانم بە نیازی ڕۆیشتنی، هەر کاتێکیش گوێم لە ووشەی سەفەر دەبێ هەرەس دێنم، توشی شۆك دێم،

خەم بەرۆکم دەگریّو کلیلی بەختەوەریم لیّ وون دەکا، سەفەری تۆ تیغێکە بە رۆحو هەستو ئەوینمدا دەچەقیّ.. ئەزیزم.. گەر دەزانی رۆیشتنت هاتنەوەی لەگەڵ نیە مەڕۆ، گەر دەزانی جانتا لەهجەی فرێدان نازانیّ کۆچ لە شان مەکە، گەر دەزانی پەناهەندەی بەختەوەری وەرناگری پەساپۆرتی گیرفانت بسوتێنە، مەڕۆ تکای ئەوینمت لیّ دەکەم مەڕۆ.. من چی لە جەستەیەکی بیّ گیان بکەم بە بیّ تۆ من چی لە.................".

هەر ئەوەندەی تیا مابوو دێڕەکانی دیکەی نەمابوون نەیدەزانی چی دیکەی تیا نوسرابوو، چەند مانگێک بەسەر چوو شێتە نە رۆژنامەکەی بینیو نە نامۆش نامەی دیکەی نوسی بۆ ئەویّ چونکە لەگەڵ رۆیشتنی کامۆ هەموو شتەکان کۆتایی پیّ هات، شێتە بیستیەوە کە نامۆ بۆ دواجار نامەیەکی ماڵئاوایی نوسیوەو فلانە رۆژ دەیبات بۆ رۆژنامەکەو دەیداتە دەستی سەر نوسەری رۆژنامەکە، بۆیە بەپەلە ئەو نامەی کە شێتە خۆی نوسیبووی ویستی لە هەمان رۆژ بیگەیەنەتە رۆژنامەکەو لەوێندەر نامۆش بناسیّ.. رێکەوتە بە بۆنەی بردنی نامەکە چاوی بە نامۆ بکەویّ.

نامەکەی بردو هێشتاکە ئەو بارەگایە نەکرابووەوە کە شوێن دەرچوونی رۆژنامەکە بوو، شوێنێك بوو دەکەوتە ناوەڕاستی بازاڕو لە تەلارێکدا لە قاتی سێیەمین بوو، چەند دوکانێکی لە بن ئەو تەلارە کرابوونەوە، لەسەر پەیژەکان دانیشت چاوەڕوانی دەکردنو لە هەمان کاتدا چاوەڕوانی نامۆی دەکرد کە لە هەمان رۆژ ئەویش دەهاتە ئەویّو دوا نامەی دەهێنا، یەکێکیان گەیشتو وا دیار بوو شێتەی باش دەناسی، رێزیّ زۆری لیّ گرتو بردیە ژوری سەرنوسەر داینیشاند، شێتە پرسیاری هاتنی سەرنوسەری لیّ کرد کە چ کات دەگات، بەڵام پیاوەکە کە پیاوێکی زۆر جوانو کاڵ بوو لە کاڵیا رۆحی دەبینرا بە "نازانم" وەڵامی دایەوە، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا شێتە دەستی نا بە بن چەناگەیو بیری دەکردەوە خۆی بۆی گێڕامەوە:

"ئێستا گەر نامۆ هات چۆن بیناسم، نانا دەیناسم رۆحم پەیوەستە بە رۆحی ئەوەوە بەڵام چیّ پیّ بڵێم..؟ دڵم خەریکە لە جەستەم دەردەچیّ هەست دەکەم توشی شۆکێك دەبم، گەر هات پێی دەڵێم حەز دەکەم لە نزیکەوە بتناسم خانم گیان، باشە نالیّ بۆ..؟ دەیەڵە قەیچێکە با واش بلیّ پێی دەڵێم من یەکێکم لەو کەسانەی بەردەوام

نامەکانت دەخوێنمەوە، بەڵام ژمارەی پێشوو نیو نامەیەم خوێندووەتەوە حەز دەکەم تەواوکەری نامەکەم بداتێو بشزانم بۆ هەمووی کڕیبووەوە"

شێتە مەگەر شێت نەبووبێت دای لەشەقەی باڵ فڕی لەسەر لقی درەختی ئەو ساڵانە نیشتەوە کە منداڵ بوو ، هەرچی دەکرد سەری نەدەگەیشتە ئاوێنەکە تەماشای خۆی بکات، چونکە ئاوێنەکەیان زۆر بەرز لە دیوارەکەدا هەڵواسیبوو, دواتر ئەو ساڵانەی بیرکەوتەوە کە تازە هەڵچووبوو سینگی بەرزەوە ببوو لەشێکی نەرمو نۆڵو جوانی هەبوو، پشتی خۆی کۆم دەکردەوەو جلو بەرگی پانی دەپۆشی تا نەزانن گەورە بووە، شەرمی دەکرد لە ئاوێنەکە تەماشای خۆی بکاتو دەست بە سینگو جەستەی دابێنێت نەبادا باوکو برای بێنە سەری، دواتر بیری لە ئێستای کردەوە کە نە بچوکە تا سەری نەگا بە ئاوێنەکەو نە ئەو کچە تازە هەڵچووەشە شەرم لە گەورەبوونی خۆیو لە ئاوێنەکە بکات، ئێستا تەماشای ئاوێنە دەکات بەڵام بە ماکیاژ خۆی دەبینی، ماکیاژ دەکات پاشان دەچێتە بەرامبەر ئاوێنەکە، دەمامک دەپۆشێ، تا ئێستا بە جوانی خۆی نەبینیوەو نەناسیوە بۆیە ووتی:

"ئەمڕۆ هەر کە چوومەوە ماڵێ بە رووتی سەیری رووتی خۆم دەکەم تا خۆم ببینمو خۆم بناسمو لە ئاوێنەکەدا لەدوی راستی خۆم بگەڕێمو خۆم بدۆزمەوە بەر لەوەی ون بم، ناکرێ تا هەتایە بچوک بمو شەرم بکەمو دەمامک بکەم نابێ نا".

چایەکیان بۆ هێناو شێتە سوپاسی چایچیەکەی کردو پرسیاری نامۆ لێ کرد، وەڵامی دایەوە کە نازانێ کێیە بەڵام دەزانێ یەکێکە لەوانەی نامە بۆ رۆژنامەکەیان دەنووسێ، شێتە سەیری هات بەڵام خۆی بێ دەنگ کرد.

نامۆ کەسێکی نادیار بوو تەنها نامەکانی دەبینرا, کەس نەیدەزانی کێیە جگە لەسەر نوسەری رۆژنامەکە ئەوەش نهێنییەك بوو نەدەبوو لای کەس بیدرکێنێو راستی روخساری نامۆ ئاشکرا بکات، سەرنوسەری رۆژنامەکە گەیشتو شێتە لەبەری هەستایەوە بەتوندی تەوقەی لەگەڵدا کردو بەخێرهاتنێکی گەرمی کرد، شێتە لە شوێن خۆی دانیشتەوەو دوای گفتوگۆیەکی زۆرو گێڕانەوەی چیرۆکە سەیرەکانی لەو شارەدا هەبوون هەر دوو لا بێ دەنگ بوون چ سەرنوسەری رۆژنامەکە چ شێتە..

جار نەجارێ ئاوڕێکی لای دەرگاکەی دەدایەوە سەیری دەرەوەی دەکرد تا بزانێ کەی نامۆ دەگات، چونکە

هەموو مەبەستی هاتنی ئەوە بوو نامۆ بناسیٚو دوانامەی بخوێنێتەوە بەر لەوەی بلاوی بکاتەوە, نەبادا ئەمجارەش دەستی نەکەوێتەوە، سەرنوسەری رۆژنامەکە پرسی:

. ها چیت بۆمان هێناوە..؟ دەمێکە دەنگت نیە

. بمبورە سەرقاڵی کارو خەمی دونیام

ـ کچیٚ دە بژی بژی بۆ خۆت واز لە خەم بێنە هێندە رەشبین مەبە

ـ رەشبین نیم دونیاکەم وەیشومەیە، دەکریٚ لە پرسەی یەکێك دانیشیو هەستی شایی بکەی..؟

. نەوەڵلا ناکریٚ بەلام ئیدی چی دەکەی خۆ نابیٚ خۆیشت بکوژی

. بەخوا نازانم چی بکەم بەڕێزم جاریٚ وا دەیبەینە سەر هەتا دەمرین

ـ گەر خوانەخواستە مردی, چلەیەکی جوانت بۆ دەگێڕینو پەیکەریشت دروست دەکەین

. چلەم بۆ مەکەن، من کە مردم لەخۆم دەڕۆم لەکەس نا، گەر منیشتان هێندە خۆشدەویٚ ئێستا پەیکەرم دروست بکەن نەك کە مردم.

. ئاخر لە ولاتی ئێمەدا وا باوە دوای مردن بیر لە جوانیو شتە باشەکانی ئەو کەسە بکەینەوە تا لە دونیا مابیٚ کەس نایبینیٚو کەس رێزی لیٚ ناگریٚ

. دە هیچم ناویٚ هیچم بۆ مەکەن، مردم فڕێمدەنە چەمێك با سەگو مێروو بمخۆنو تێر بن

دەنگێك هات دەنگی کچ بوو، شێتە راپەڕی چاوەڕێی بینینی رۆخساری دەکرد، دەنگەکە تا دەهات نزیکتر دەبوو، هاتە ژورەوەو نامۆ نەبوو بەڵکو ئەو کچە بوو کە شەڕی بە شێتە دەفرۆشتو مەراییو بۆ هەریاد دەکرد، زۆری رق بووەوە، چاوەڕوانی نامۆی لە بیرچووەوە، بە دەمو چاوێکی گرژەوە بۆ ئەوەی زوتر ئەوێندەر بەجێبهێڵیٚو لەو دەمو چاوە رابکات هەستایە سەرپیٚو دەستی بردە نێو جانتاکەی شانیو نامەکەی دەرهێنا

ـ فەرموو بەڕێزم ئەو نامەیەم بۆ هێناوی، تا لە رۆژنامەکەتان لە لاپەڕەی "ستونی رازەکان" بۆمی بلاو بکەنەوە

. ئای دەستخۆش

لە ناکاو نامەکە لە نێوان دەستی شێتەو سەرنوسەری رۆژنامەکە بەرەوە بوو کرایەوە، شێتە هەڵیگرتەوەو لە

جێی خۆی تەزی، لە خوار نامەکە کە ناوی نوسەری پێوە بوو کە خۆی نوسیبووی، نوسرابوو (نامۆ).
بە دەنگێکی کزو لەسەرەخۆ کە بەس خۆی گوێی لە دەنگی خۆی بوو ووتی:
"ئاااااای ئەوە من بووم"

## بەشی کۆتایی

(ئەو) دوو سێ جار لەسەر یەك ئەو دێڕەی دوبارە کردەوەو باسی شێتەی کرد کە لەوێندەر خۆی دۆزیەوە, لەوێندەر منیش لە ئاوێنەکە هاتمە دەرێ و تێگەیشتم دوانامەی نامۆ نامەی شێتە بوو، بەڵام ئیدی دوانامەی ماڵئاوایی نەخوێندرایەوەو زەنگی مۆبایلەکەی (ئەو) لێیدا، ویستم گوێ رادێرم بزانم کێبوو ئەو کەسەی کە ئەو چاوەڕوانی زەنگەکەی دەکرد، دەنگی کوڕێکی ناسك بوو.
ووتی:
. ئەلو
. ئەلو گیان دەزانی لە کەیەوە چاوەڕێت دەکەم تەلیفۆن بکەی، هەموو ساڵەکانی تەمەنم هاتەوە بەرچاوو وەك چیرۆك بۆ خۆم و ئاوێنەکەم گێڕایەوە تۆ هەر دەنگت نەبوو
. بمبورە نامۆ گیان ئیشم هەبوو

